پەری عومەر خەیلانی

# ئەدەبی زیندان



لێکۆڵینەوەی ئەدەبی

چاپی یەکەم
٢٠٢٤






**دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **ئەدەبی زیندان** / کۆڕۆمانی بووژانەوەی ژیلەمۆ وەک نموونە
- **بابەت:** لێکۆڵینەوەی ئەدەبی
- **نووسین:** پەری عومەر خەیلانی
- **هەڵەچن:** عزەددین زەکیزادە
- **نەخشەسازیی ناوەوە:** گۆران رواندزی
- **بەرگ:** شکار عەفان نەقشبەندی
- **نرخ:** ( ٤٠٠٠) چوار هەزار دینار
- **چاپ:** (یەکەم) ٢٠٢٤
- **تیراژ:** ٥٠٠ دانە
- **چاپخانە:** هێڤی (هەولێر)
- لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٣٥٦)ی ساڵی (٢٠٢٤)ی پێ دراوە

زنجیرەی کتێب (١١٤٢)

**ماڵپەر:** www.mukiryani.com

**ئیمێل:** info@mukiryani.com

**پێشکەشە ...**

- بەوانەی زیندانیان کردە قوتابخانە.
- بەوانەی زیندان نەیتوانی ئیرادەیان تێکبشکێنێ.
- بە زیندانشکێنەکان.
- بە ڕەوتی زانستی وێژەی کوردی.
- بە مامۆستاکانم.
- بەوانەی لێیان فێربووم.

## ناوەرۆك

# ڕەخنە بە هاوێنەی پەری

گۆران سەباح

ئەم کتێبە ڕەخنەییەی بەردەستت نموونەیەکی ڕاستگۆ و کردەنیی ڕەخنەی ئەدەبییە.

هەر ڕەخنەگرێک، ڕۆماننووسێک، تۆژەرێک و خوێنەرێک دەتوانێت سوودی لێ وەرگرێت. من بۆ خۆم وەک ڕەخنەگر و ڕۆماننووس سوودم لێی وەرگرتووە .. بۆ؟

مادام دنیای ڕۆمان فراوانە، یەک شێواز نییە بۆ ڕەخنەگرتن لێی. هەر ڕەخنەگرە و هاوێنەیەکی تایبەت بە خۆی هەس. هاوێنەی پەری، هاوێنەیەکی ساف و بێ گەردە، وات لێ دەکات بە ئاسانی پەی بە کۆدەکانی کۆڕۆمانی بوژانەوەی ژیلەمۆ ببەی.

هاوێنەی پەری، هاوێنەیەکی هاوسەنگە. لە پاڵ خاڵە لاوازەکانی کۆڕۆمانەکە، خاڵە بەهێزەکانیشی باس کردووە. ئەم هاوسەنگییە بۆ ڕەخنە گرنگە. ڕەخنەکانی هەڕەمەکی نین. بۆ هەر ڕەخنەیەک، نموونەیەک دەهێنێتەوە لە دەقەکە. هەرچەندە نموونەکانی درێژن، بەڵام دیارە هاوێنەکە بە پێویستی زانیوە چەند وەربگرێت لە هەر نموونەیەکدا.

بۆ هەگبەی ڕەخنەی ئەدەبی، ئەم کارە یەکجار پێویست و گرنگە. بە پشییەکی درێژ و زانیاری دروست نووسراوە. وەها ئاسان نییە بە کتێبێک ڕەخنە لە دەقێکی ئەدەبی بگری. کۆڕۆمانی بووژانەوەی ژیلەمۆ

دەقێکی قووڵە، چەندان لکی لێ دەبێتەوە، بۆیە هاوێنەی پەری بووەتە چەندان لک و فرەڕەهەندیی دەقەکەیان داوەتە بەر ڕەخنەی پڕۆفێشناڵانە. بە وردی دەنۆڕێتە کۆڕۆمانەکە، ئەوە تەنیا بە ڕەخنەگر دەکرێت.

ڕەخنەگرتن و قسەکردن لەسەر ڤەگێڕ، پاڵەوان، کارەکتەرانی تر، ڕووداوەکان، تەکنیکی فلاشباک، چەمکی دایک، گرێ، چەمکی کۆڵنەدان، چەمکی هەڵاتن، ئازار، ئازایەتی، ئەودیو سنووری لۆکالیبوون، شوێن، دەرچوون لە حیزب و ڕەپێشدانی کوردبوون پێش هەموو شتێک و دەیان بابەتی تر ئەم کتێبەیان دەوڵەمەند کردووە.

ئەم هەوڵە، بێ لەوەی بەستەڵەکی ڕەخنەی ئەدەبیی کوردی دەتوێنێتەوە، ئەدەبی زیندانیش شی دەکاتەوە کە لای ئێمە هێندە بایەخی پێ نەدراوە (وەک خاتوو پەری دەڵێت ئەدەبێکی بێ نازە). زیندووی دەکاتەوە و پێمانی ئاشنا دەکات. گریمان ئەم کتێبە ڕەخنەییە نەبا، کام خوێنەر بەو هاوێنەیە تەماشای دەقەکەی دەکرد، کێ هێندە گرینگی بە ئەدەبی زیندان دەدا؟ دەق لەسەر ڕەفەی کتێبخانە دەکەوێت، بە مردوو حسێبە. ئەوە ڕەخنەگرە دێ زیندووی دەکاتەوە و هانی خوێنەران و تۆژەران دەدات بێن بیخوێننەوە و تۆژینەوەی لەسەر بکەن. هیوادارم ئەم هەوڵە ئەوها بێتە سەیرکردن، ڕەخنەگر و تۆژەری تر، بێن زێتر ئیشی لەسەر بکەن.

# بەشی یەکەم

# تیۆری

## سەرنجێک لەسەر ئەدەب:

ئەدەب بۆیە نابێتە زانست: چونکە دژی هەموو لەقالبدان و مەنگبوونێکە، ئەدەب دەیەوێت رووبارێکی لەبەر رۆیشتووی زەمەن بێت، تەریب لەگەڵ هەست و نەستی مرۆڤایەتی ڕێ بکات، بەرزی و نزمی، ساردی و گەرمی، خۆشی و ناخۆشی، کەوتن و سەرکەوتن، فەلسەفە و مەعریفە وێنا بکات و بگێڕێتەوە، گەر دەقی "هەریەکەو کەوتنی خۆی هەیە" ی (کەریم دەشتی) نەبوایە کێ دەیتوانی پەی بەم هەموو کەوتنەی مرۆڤ بەرێ لە تەختاییەکانی زەوی؟ کەوتنی سەرخۆشەکان، کەوتنی هاملێت و شالێر کەوتنی شووشە عەتر و نەورەسەکان و تابلۆ و ئاوێنە و عەشق، هەتا کەوتنی خواکانیش.. ئەدی شیعرو مەعریفە و جوانییەکانی (نەزەند بەگیخانی) دیون؟ ئەو نەبوایە کێ دەیزانی کورد هێندە لە سرووشتەوە نزیکە و یارسانەکان بە تەنبوورەکانیان سرووشت و زەوی دەلاوێنن؟ سیحر و تەلیسمی ئەدەب لە چاوتروکانێک زەمەن ژێرو ژوور دەکات .. دوێنێ دەکاتە سبەی و دووسبەیش دەکاتە ئەوێڕۆژێی غاردانی تەمەن .. ئەوە نییە (عزەددین زەکی زادە )لەزەمەنی دوای دووسەد ساڵی دیکە دێت و سەربووردەی نوستالۆژیای خۆڵمان بۆ دەگێڕێتەوە؟ بۆیە تاجی ئەدەبی ڕاستەقینە بچێتە سەری هەرکەس، ئەو پادشای هەقیقی دنیا دەبێت؛

چونکە ئەدیبی ڕەسەن لەسەرووی خاکەکەی خۆیەوە کە (زەوییە) دەڕوانێتە بوون.

بینەر و هاودەرد و گوێزەرەوەی هەموو ژانێکە ..ژانی مرۆڤ و ئاژەڵ، ژانی ڕووەک و دەریا، تاشە بەرد و دارستان و بیابان، ژانی تاریکایی و ڕووناکایی... ، تاد. بۆیە کاتێک سۆفییە یاخییەکەی گەردوون (لەتیف هەڵمەت) دەبینین و دەیەوێ : لەدیداری مێروولەیەک ببێتە دەنکە "گەنم"! نەکا مێروولە بترسێ لە پێ پیانان و هەنجنین.. چی زەینی مرۆڤ بۆ ئەمە دەبات ؟ ئەدەب نەبێت؟ ئەدەب مینبەر و مێرگی نەدارو دارایە ، پەنای وڵاتدار و بێ وڵاتە، گڕی عەشقی (جەلالی مەلەک شا ١٩٥٢- ٢٠٢٠) بۆ کچە قەرەجێک و گرێدانی بە زامی نیشتمان لە چ پانتاییەک جێی دەبێتەوە ئەدەب نەبێت؟ قەسیدەکانی (شێرکۆ بێکەس ١٩٤٠- ٢٠١٣) نەبا کێ دەیتوانی سروودە یاخییەکانی ئەنفال و کیمیاباران بکاتە چامە بۆ چلەی هەموو شەهیدانی کوردستان؟ کێ دەیوێرا لەبەردەم وەفدی وڵاتان و مرۆڤپارێزی جیهان بڵێ قوربان: لە کەناری هەر جۆگەیێ، لەسەر سەکۆی هەر مزگەوتێ، لە بەردەرگەی هەر ماڵێ، هەر کڵێسەیێ، هەر ئەشکەوتێ، ئەدەبە یاخییە گەردەن کێلەکەی (عەبدوڵڵا پەشێو) نەبا؟ ئەسڵەن لەم کۆمەڵگە ماندووە و لە بەشێکی ئەم نەریتە چەقبەستووە، لە گەڕەلاوژەی ئەم هەموو نێرسالاری و دەمارگیرییە ئایینییەدا ئەدەبە پڕ زام و گریاوەکەی (ڕێبوار سیوەیلی) نەبا کێ دەهات بە قەسیدەیەکی سپیی (دوعا)ی داماڵدراو لە شمەک و گۆشت و پێست و هەزار جار بریندار و سەدجار شەهیدی بن دار و پەردوو و بلۆک و بەرد داپۆشێت و بیلاوێنێ؟! بۆیە ئەوە وێژەیە هەمیشە دەتوانێت کاری زۆر گرنگ بکات و لە هەموو قوژبنەکانی ژیان بکۆڵێتەوە، بەتایبەت لە هەردوو ڕەهەندی کۆمیدیا و تراژیدیا، لەوێوەش پادشای ساتیر و کۆمیدیای ڕەش (چارلی چاپلن

(١٨٨٩-١٩٧٧) بە جولەکانی فرمێسک ئیدەیت دەکات بۆ خەندە..، لێرەوە زیاتر لە گرینگی ئەدەب تێدەگەین چۆن هەوڵدەدا کۆمەڵگە یان هەر هیچ نەبێت تاکەکانی کۆمەڵگە ڕاچڵەکێنێت و ڕاڤەی بوون و مەرگ و ئەرک و وابەستەیی و خوردکردنەوەی دەوروبەر لە خۆی بگرێت و دەسەملانێی ئازار، گۆرانی بۆ شادی بڵێت. هەر لەو سۆنگەیەوەش ئەدەبی ڕەسەن دەتوانێت بمانباتە نێو فۆڵدەر و دیوەکانی دیکەی ڕووداوەکان .. ئەوانەی لامان شاراوەن، یان بە ئەنقەست پەراوێز دەخرێن، ئەوا لە ڕێی دەقە ئەدەبییەکانەوە دەتوانین پێیانەوە ئاشنا بین، هەڵبەت باسکردن و ناوهێنانی ئەو کەسایەتییانەی سەرەوە بۆ ئەوەیە کە دووپاتی ئەوە بکەینەوە (ئەدەب) لە دروستکردنی کاریگەرییەکان پشکی شێری بردووە، لەنێو هەموو ئەدەبی گەلانیش نەک هەر لای خۆمان، ئەمەش بەهۆی هەموو ژانرەکانییەوە نەک هەر شیعر، بۆیە کە دێینە سەر ژانری چیرۆک و ڕۆمان و یادەوەری و گێڕانەوە و ژیاننامە، ئەوا هەمان کاریگەری و بوونیان هەیە، لەسەر خودی مرۆڤ و هەموو گۆشەکانی دیکەی ژیان، ڕۆڵ و ئاسەواری جوان و بەهاداریان هەبووە و جێهێشتووە، لەپشت هەر ونبوون و دوورەپەرێزی ئەدیبێکی ڕاستەقینە دەبێت بزانرێ ئەو وەک ئەستێرە لەناو تاریکایی و قوڵایی خەمی کۆمەڵگەکەی دایە و دەیەوێت وەک باڵدارێکی تەنیا هەڵنیشێت و چەندین ئاواز بخوێنێت .. بۆیە ئێمە و گەلانی دنیاش نابێت هەژەند بمانگرێت، کاتێک (یۆن فۆسە)ی گەورە نووسەری نەرویجی خەڵاتی (نوبڵ)ی ئەدەبی ٢٠٢٣ دەبات، ئەو لەو هەموو دوورەپەرێزییەی شاکار دەچنێ، بە نموونەی شانۆنامەی (کەسێک هەر دێ) هەروەها (عەزیزی مەلای رەش) لە ئەرزی واقیع گەر دکتۆرایشی لە ئەدەب هێنابا هەر (کوێخا سێوێی) دەهۆنییەوە، بۆیە ئەدەب زانست نییە بەهرەیە، بەهرەش لەسەرووی زانستەوەیە، چونکە

ئەوانەی لەبواری زانست داهێنان دەکەن، بریتیین لەوانەی بەهرەیەکیان هەیە پەیوەندی بە ناوەوەی ئەقڵ و پێکهاتەی مرۆڤێتییانەوە هەیە و ناونراوە (زانست) کەواتە دەتوانین بڵێین گەلێجار ئەدەب و ئەدیبیش پێشهاتی زانستی دەکەن یان پەی بە داهێنانی زانستێک دەبەن، چونکە وەک گوتم زانست پێش ئەوەی زانست بێت بەهرەی هەست و شعووری مرۆڤەکەیە، ئەوجا لەدەرەوەی کەسەکە پراکتیک دەکرێت، وەک ئەو پێشهاتانەی شاعیری کورد (ئێل بەگی جاف ١٤٩٢-١٥٥٣)
دەیکردن و بەقۆناغ هاتوونە دی، وەک بۆ بابەتی پەیدابوونی فڕۆکە دەڵێت :

تەیرێ وەک رەعد و بەرق دەبێ
گوێچکەی لە دووکەڵ غەرق دەبێ
دەشت و دەری پێ لەق دەبێ
بە رووی هەوا مۆلەق دەبێ.

ئا ئەمە ئەدەب لەلای من و زۆربەی ئەوانەی وێژە بەشێکی گرنگە لە ژیانیان، بۆیە هەموو ئەو ناوانەی باسمکردن مشتێکی خەرمانی گەورەی ئەدەب و داهێنانن، دەنا زۆرن ئەو نووسەر و خودان هزر و داهێنانانەی دەکرێ بە سەنگ و شکۆی خۆیانەوە لە بڵندایییەکانی ڕەخنە و لێکۆڵینەوەی ئەدەبیدا دەربکەون.

**ڕەخنەی ئەدەبی لە نێوان ڕازیبوون و ڕەتکردنەوەی دا:**

کاتێک بتەوێت ببیتە نووسەرێکی باش، بەر لەوەی بەهرەکەت گەشە پێ بدەیت و پەروەردەی بکەی؛ زۆر گرنگە بەوردی چەند شتێک لەخۆت بپرسیت .. ئایا بۆچی و بۆ کێ دەتەوێت بنووسیت؟ ئەی لەپێناو

چی دەنووسیت؟ ئەو کاتەی بەهرەی نووسین هۆشیاری و دانایی لەگەڵ بێت (دەق) دەکاتە گۆڕەپان و بەشێوەیەک دوو ڕێڕەوی لێ ببێتەوە، تیایدا خوێنەری ڕاستەقینە و فەیک لێک جوێ بکاتەوە، چونکە خوێنەری جددی ئەگەر هیچیش لە خەسڵەت و بنەمای زانستی ڕەخنە نەزانێت لە دوای خوێندنەوەی هەر دەقێک ڕا و بۆچوونی خۆی لەبارەیەوە بنووسێت، ئەگەر بۆ کەسیش بەیان نەکات، وەک دیتوومانە لە کۆتا لاپەڕە یان لە کاغەزێک خوێنەر هەبووە سەرنجی خۆی نووسیوە و جێیهێشتووە، بەم کارەی خوێنەر دەگوترێت: چالاکی ڕەخنەیی.

- **کورتەی مێژووی ڕەخنە:**

لە هەموو جیهان ئەگەر بێت و لە مێژووی ڕەخنە بدوێیت، ڕێگاکان دەمانبەنەوە سەر دوو شاڕێگای ڕەخنەیی ئەوانیش (ڕەخنەی ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەڵاتییە)، خۆ ئەگەر بە درێژیی لێیان بدوێین بەدەیان لاپەڕە پڕدەکەینەوە، بەڵام بەقەد پێویستیمان لێی هەڵدێنجین. سەبارەت بە ڕەخنەی ڕۆژئاوایی ئەوا لە پێش زایین و لە لایەن یۆنانییەکانەوە سەری هەڵداوە، هەروەک لە سەرچاوە مێژووییەکانەوە هاتووە: لە (سەدەی پێنجی پ.ز) یۆنانییەکان لە جەژنەکانیان کۆمەڵێک چالاکییان پێشکەش دەکرد؛ بەتایبەت شانۆگەری جا کۆمیدیا با یان تراژیدیا؛ ئەمانەشیان بە شیعر پێشکەش کردووە، لەو میانەیەدا ئەوان لەوکات بڕیاری پەسندکردنی دەقە شانۆییەکانیان داوە، ئەمە کردەیەکی ڕەخنەییە و لەسەر بنەمای هونەری باڵا و لوژیکی ڕاستەقینەیە. لێرەدا کاتێک دەبینین ئەریستۆڤانیس (٣٨٦-٤٤٦ پ.ز) وەک شاعیرێک دێت لەبەرهەمە کۆمیدییەکەی خۆی کە کتێبی (بۆقەکانە) قسە و باسی لەبارەی هەردوو شاعیری گەورەی یۆنانی (یوربیدز و ئەسخیلۆس) دەخاتە ڕوو، ئەم هەنگاوە پڕ بزاوتە ڕەخنەییانە وایکرد سایدێکی

ڕەخنەی ئەدەبی بکرێتەوە؛ تیایدا بەدەیان فەیلەسوف ببنە جێی بایەخ، بەتایبەت هەردوو قوتبی فەلسەفەی جیهانی بەگشتی و یۆنانی بەتایبەتی (ئەفلاتون ٤٢٨پ.ز – ٣٤٨پ.ز) و (ئەرستۆ ٣٨٤ پ.ز – ٣٢٢پ.ز) کە تا ئەم قۆناغەی ئەدەب جێی هەڵوەستە لەسەر کردنن. هەر لە نموونەیەکی دیکەی تایبەت بە (ئەرستۆ) دا هاتووە، لە بەرهەمێکی دیکەی بەناوی (هونەری شیعر) کۆمەڵێک دەستوور و یاسای وەهای بۆ بابەتی (تراژیدیا) دارشتووە کە دواجار بوونەتە بناغەی تیۆری (ڕەخنەی ئەوروپی). لەدوای ئەوەش کاتێک (ڕەخنەی کلاسیکی نوێ) وەک ڕێبازێکی ئەدەبی لەسەدەی حەڤدەدا لە فەرەنسا سەری هەڵدا و گەشەی کرد. ئەمەش زیاتر لەسەر دەستی ڕەخنەگری بەتوانای سەردەمی ئەوسا (بوالو ١٦٣٦- ١٧١١) ڕا و بۆچوونەکانی ئەرستۆی جێگیر کرد و کردنی بە پێوانەی ڕەخنەی کلاسیکیی نوێ لە ئەوروپادا، هۆی ئەمەش ئەوە بوو ڕێبازی کلاسیکی بۆخۆی لە ئاکامی بوژاندنەوە و لاساییکردنەوەی بەرهەمی یۆنانییەکان و ڕۆمانییەکان سەری هەڵدا. هەروەها بەرهەمی کلاسیکەکان (تراژیدیا و کۆمیدیا) بوون، ئیدی لە دوای ڕێبازی ڕۆمانتیکی کۆمەڵێک ڕێبازی دیکەی ئەدەبیی سەریان هەڵدا وەک: ڕێبازی ڕیالیزم، پڕناسی، هێماگەری، فۆرمالیزم و هتد... لەپاڵ ئەم ڕێبازە ئەدەبیانەشدا چەند ڕێبازێکی ڕەخنەیی هاتنە کایەوە گرنگترینیان ڕێبازی شیکاری دەروونی و ڕێبازی مارکسی و ڕێبازی شێوەگەرایی یان بنیاتگەری بوون؛ بەگشتی ڕەخنەی نوێ لە ئەدەبی ئەوروپی سەدەی ڕابردوودا پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت دەبێ: پێوانە ڕەخنەییەکان بابەتی بن و لە بازنەی تێڕوانینی کەسیی ڕەخنەگردا نەهێڵدرێتەوە، بەڵکو ڕاستەوخۆ لە سرووشتی دەقی ئەدەبی خۆیەوە بەدەست بهێنرێن. هەروەها مەبەست لە ڕەخنەی ڕۆژهەڵاتی " ئەو ڕێگا ڕەخنەییەیە سەرەتا لە ئەدەبی عەرەبیدا کراوەتەوە و پاشتر لەلایەن

ئەدەبی میللەتە موسوڵمانەکانی دیکەوە فراوانتر و بەربڵاوتر کراوە و بووەتە تیۆرێکی ڕەخنەیی تایبەت بەو گەلانە، هەروەها پاش بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام، پێوانە رەخنەییەکان لە ڕێنماییەکانی ئایینی ئیسلامەوە بەدەستدەهێنران و لە ڕوانگەی باوەڕی ئایینی شاعیرەوە لەدەقی هۆنراوە داوا دەکرا شاعیران دەبێ "پەیامدار" بن و بەرهەمەکانیان لە خزمەتی کۆمەڵگا دابێت. قۆناغێکی گرنگی ئەم ڕێگا ڕەخنەییە سەردەمی عەباسییەکان بووە کە بەهۆی تێکەڵاوبوونی ڕۆشنبیری گەلانی موسوڵمانەوە و ئاگاداربوونیان لە ئەدەب و ڕەخنەی یۆنانی بەتایبەتی "هونەری شیعر"ەکەی ئەرستۆ، پێوانە ڕەخنەییەکان فراوانتر بوون و بەرەو بایەخدان بە لایەنی هونەری براون؛ هەروەها زیاتر ئەو تێڕوانینە ڕەخنەییە پەیڕەوی کراوە بەلایەوە دەقی شیعری چنراوێکی زمانییە و دەبێ شاعیر بایەخ بە لایەنی جوانکاری دەقەکە بدات، ئەو لەو بوارەدا توانا و دەسەڵاتی هونەری خۆی پیشان بدات، لەسەدەی نۆزدە بەدواوە ئەو ڕێڕەوە ڕەخنەییە بە سوود وەرگرتن لە ڕێبازە ڕەخنەییە ئەوروپییەکان گەشەی کردووە و ئاوێتەی ڕێبازە ڕەخنەییە جیهانییەکان بووە. لەدوای ئەم باسە کورتەی سەرەوە ئێستا بەرچاو ڕوونترین لە باسکردنی مێژووی ئەدەبی کوردی .. ئەدەبی کوردی مێژوویەکی دێرینی هەیە و کۆنترین جۆری ئەو ئەدەبەش شیعر بووە، لەپاڵیشیدا لەگەڵ پێشڤەچوونی شیعری کوردیش ڕەخنەی ئەدەبییش سەری هەڵداوە و گەشەی کردووە، چونکە گوێ لێ بوون یان خوێندنەوەی هەر شیعرێک وایکردووە تێڕوانینی رەخنەییش بۆ پەسەندکردن و پەسەندنەکردنی دەق سەرهەڵبدا و دروست ببێت؛ ئەگەر بەشێوەیەکی سادە و ساکاریش بوو بێت و هیچ پێوەرێکی زانستی ڕەخنەییشی لەگەڵ نەبووبێت. لەگەڵ ئەوەشدا چالاکی و بەرهەمی ڕەخنەییمان لەچاو بەرهەمی شیعریدا کز و لاواز دەبینرێت

چونکە تا ئێستاش وتار و لێکۆڵنەوەی ڕەخنەیی پێش سەدەی بیستەممان نەهاتووەتە بەردەست و ئەو بەرهەمە ڕەخنەییانەی هەنە مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ سالانی بیستی سەدەی ڕابردوو بە دواوە کە ڕۆژنامەگەری و چاپەمەنی کوردی تیایدا بەرەو گەشەسەندن چووە، لەگەڵ ئەو دیاردەی کزی و لاوازییەی ڕەخنەی کوردیشدا، دەکرێت ئەو ڕاستییە بخرێتە بەرچاو کە لە قۆناغە جیاجیاکانی شیعری کوردی پێش سەدەی بیستەمدا چالاکی ڕەخنەیی لە ئارادا بووە و شاعیرانی کورد خۆیان لە بەرهەمە شیعرییەکانیاندا تێڕوانین و بۆچوونی ڕەخنەییان خستۆتە بەردەست و دەستنیشانی کۆمەڵێ پێوانەی ڕەخنەییان کردووە. یەکێک لەو شاعیرانەی لە بەیتە شیعرییەکاندا کۆمەڵێ باسی ڕەخنەیی وروژاندووە، مەلای جزیرییە .. لە شیعرێکیدا دەڵێ:

ئەحسەن ژ ڤی نەزمی لەتیف
چەندی سڤک هاتی خەفیف
مەحبوب بدەستێ خوی شەریف
نەقدی مە مووهر و سککەدا
ئەحسەن ژ ڤی وەسفێ ڕەفیع
ئەشکال و ئەوزاعێن بەدیع
تێتن ژ نورێ وەک ڕەقیع
بێ عەیب و نەقی و ڕەخنەدا.

لەو چەند بەیتەدا، مەلای جزیری وشەی ڕەخنەی بەو واتایە بەکارهێناوە کە ئێستا بەکاردەهێنرێت، لەپاڵ ئەو وشەیەشدا کۆمەڵێک زاراوەی ڕەخنەیی بەکارهێناوە کە هەریەکەیان تایبەتە بە چەند پێوانەیەکی ڕەخنەی شیعرییەوە، وەک (نەزمی لەتیف) و (سڤک) و (ئەشکال و ئەوزاعێن بەدیع)، بەو پێوانانەش ئەو بنەما ڕەخنەییە

دەستنیشان دەکات کە بەلایەوە: باشترین شیعر ئەو شیعرەیە وشەکانی جوان و چێژبەخش و رەوان بن و واتاکانیشی سوودبەخش بن.

**ڕەخنە وەک کابووسی نووسەر :**

(ڕەخنەگر) نابێت پێی وابێت ئەو تاکە پردی پێکگەیاندنە لە نێوان نووسەر و خوێنەر؛ ڕەخنەگری ڕاستەقینە ئەرکی ناسینی "دەقە" لەگەڵ نیشانکردنی لایەنی لاواز و کرچوکاڵیی و جوانیی و داهێنانی دەقەکە هتد...، لەپێناو خزمەتکردنی دەق و گەڕان بەدەوری سیاق و ناوەڕۆکی ڕاقی، نەک لە پێناو لەقالبدانی نووسەر و بەزۆر پێگیرکردنی بە کۆمەڵێک " کلێشە "کە ڕەنگە بە پێی وشەکانی ئەو تەنگ بن! هەروەها ڕەخنەگر ئەرکی چاودێریکردن و زەوتکردنی ئازادییەکانی نووسەر نییە، بەڵکو ڕەخنەگر ئاوێنەی دەقنووسە.

ڕەخنەگری ڕەسەن و پڕ مەعریفە هەرگیز ناکەوێتە داشۆرینی دەقنووس! کە ئەمە جگە لە نەزانین و خۆ بەزلزانین چیتر نییە، بۆیە دەبێت هەوڵبدەین (ڕەخنە و نووسین) لەگەڵ یەکتر ئاشت بکەینەوە. هەروەها مانا فراوانەکەی ڕەخنە بکەینە میتۆدی کارکردن؛ نەک دەمارگیریی و بیرتەسکی و هەڵچوون، بەشێوەیەک نووسەر تووشی فۆبیای ڕەخنە بکەین! بیرمان نەچێت هیچ دەقێک هەڵگری یەک دیو و یەک مانا نییە.

ئەگەر بێت و دەقی یەکێک لە شاعیرەکانمان بهێنینەوە وەک نموونەی پراکتیکی ئەوا هۆزانڤان ئەحمەدی خانییە کە لە (مەم و زینەکەی) بەوردی ئاوڕی لە چەند کێشەیەکی ڕەخنەیی داوەتەوە، بەجۆرێک کۆمەڵێک پێوانەی ڕەخنەیی سەردەمەکەیمان بۆ دیار دەکات، دەڵێت:

لی هێڤی دکەم ژ موستەعیدان
حەرفان نەگرن ل موستەفیدان
ئەڤ نامە ئەگەر خراپە گەر قنج
کێشایە مە دگەل وی دوو سەد رەنج
نەوبارەیی تیفلی نەورەسیدە
هەرچەند نەهن قەوی گوزیدە
لێ من ژ ڕەزان نەکر تەمەتوع
مانەندی دزان بکەن تەتەبوع.

خانی زۆر حەکیمانە ئەو ڕاستییە دەخاتە بەردەست کە دەقی شیعری دوای لەدایکبوونی لە لایەن ڕەخنەگرانەوە ڕەخنەی لێ دەگیرێت، بۆیە ئەمیش داوا لە ڕەخنەگران دەکات لەکاتی ڕەخنەگرتندا ڕەنج و ماندووبوونی شاعیریان لەبەرچاو بێت؛ ئەگەر کەموکوڕییەکیش لە شیعرەکەدا هەبوو نەیکەنە بەهانە و بەیەکجاری دەقەکە بەبێ سوود و بێ کەڵک دانەنێن، چونکە هەموو دەقێک کە ڕەسەن بێت و دزراو نەبێت وەک ڕۆڵەی شاعیر وایە و لای شاعیر خۆشەویستە و کەسیش پێی خۆش نییە بەخراپی لە منداڵەکانی بڕوانرێت، ئەم وەسفەی خانی بەو شێوە نایابە، هیچ درزێک ناهێڵێتەوە تێیدا ڕەخنەگر هەست بەوە نەکات کاری ڕەخنە و هەڵسەنگاندنی دەق بەر لەهەر شت ڕەوشت و ویژدانە .. پێویستە ڕەخنەگر خۆی بپارێزێت لەوەی ببێتە مێردەزمەی شەو و ڕۆژی نووسەر!

**نووسەر لەنێوان خاوەندارێتی دەق و سەرنجی خوێنەردا :**

بەشێک لەو نووسەرە بەڕێزانەی خەریکی نووسینن ئینجا لە کۆن و نوێ، لەگەڵ تەواو بوون و پاکنووسکردنی بابەتەکانیان، ئیدی خۆیان لەبەردەم کۆتەڵی "دەق"ەکانیان دەبیننەوە، بەشێوەیەک سەیری کارەکەیان دەکەن هیچ کەس ناتوانێت وەک ئەوان بنووسێت؛ بێ ئەوەی

دەرچەیەک بهێڵنەوە بۆ خوێندنەوەیەکی ڕەخنەییانە، هەر لەبنەڕەتیشدا بڕوایان بە مەسەلەی ڕەخنە نییە، هەڵبەت ئەو ڕەخنەیەی من باسی دەکەم بەشێوە زانستیی و ئامانجە پیرۆزەکەیەوە کە خزمەتکردنی دەقە نەک شکاندنی دەق! هاوکات نووسەرانێکیشمان هەن خاکەڕا و پڕ مەعریفەن کەچی ڕۆژگارێک لەشەرمی مامۆستاکانیان لە ڕوویان نەهاتووە یەکسەر بڵێن ئەو دەقەمان نوسیووە، بەڵکو سەرەتا گوتوویانە: جەنابی ئوستاد چی دەفەرموون لەبارەی ئەم دەقەوە؛ بە بەراورد لەگەڵ (فەریکە) نووسەرێکی ئەمڕۆ کە ناتوانی پێی بڵێی ئەم حەرفەت جێی تەنگە! یان ئەم وشەیەت لەنگە؛ یاخود ئەم دەقە کرچ و کاڵە ئاوای لێ بکە جوانتر دەبێت، ئیدی دەکەوێتە پەلکوتان و سەنگەرگرتن! لەگەڵ ئەوەش نووسەری تازەمان هەن بە شانازییەوە دەقەکەی لەگەڵ قەڵەمێکی سوور دەخاتە بەردەم کەسێکی لەخۆی بەئەزموونتر، بۆ ئەوەی لایەنی باش و خراپی بۆ نیشان بکات، لێرەوە ڕوون دەبێتەوە نووسین وەک هەر هونەرێکی دیکە پێویستی بە هەوڵ و کۆشش و خوێندنەوەی زۆرە؛ زۆر زەرووره بەر لە نووسین نووسەر کار لەسەر شێوازێکی تایبەت بەخۆی بکات و گرنگی بە ڕێنووس و خاڵبەندی بدات، ناکرێت خوێنەر بە خوێندنەوەی بابەتێک دەیان هەڵەی ڕێزمانیی بێتەپێش .. بەجۆرێک لە خوێندنەوەی بابەتەکەت وەڕس بێت، ناکرێت تۆ بتەوێت ببیتە نووسەرێکی پلە یەک و تا ئێستاش جیاوازی لە نێوان کۆمەڵێک وشە نەکەیت کە هاوواتای یەکترن، بێیت بەدوای یەکتر ڕیزییان بکەیت.

بۆیە من وای دەبینم سالانە خولی بەردەوام بکرێنەوە، بۆ فێربوونی چۆنییەتی نووسینی گوتار و بابەتی هەمە چەشن، هەر بەو جۆرەی ولیام ڤاگنەر دەیگوت "نووسەری ئارەقڕشتنی ڕۆحە.

## زیندان چییه؟

لە زمانی کوردیدا بەندیخانە یان زیندان بەکارهاتووە، لەبەرانبەریشدا لە زمانی ئینگلیزی پێی دەڵێن: Prison (ئەم زیندانە شوێنێکە بە شیش و دیواری بڵند و دەرگا و پەنجەرەی ئاسن و پاسەوان و سەربازی تایبەت تەوق دەدرێت، کەسانی تاوانبار بە تاوانی جیا جیا وەکو (کوشتن، ڕێگری و چەتەیی، بەکارهێنانی ماددەی هۆشبەر و هەموو جۆرە سەرەڕۆییەک و هتد ..) ئیدی لەو شوێنەی پێی دەڵێن: زیندان هەریەک لەوانەی ناومان بردن وەک سزای تاوانەکەیان تێیدا دەستبەسەر دەکرێن، لەلایەکی دیکەش جۆرێکە لە دامەزراوەی چاکسازی کە زیندانییەکان بە شێوەیەکی گشتی لە شوێنێکدا قەتیس دەکرێن و جوولە و چالاکییەکانیان سنووردار دەکرێن و لە نزیکەوە چاودێری دەکرێن. مەبەست لە زیندان پاراستنی کۆمەڵگایە لەڕێگەی دوورخستنەوە و گلدانەوەی تاکی مەترسیدارەوە، لەگەڵ ڕێگریکردن لە کەسانی دیکە لە ئەنجامدانی تاوان، هەروەها ڕەخساندنی دەرفەتی چاکسازییە بۆ زیندانییەکان بۆ ئەوەی لەگەڵ ئازادکردنیان ببنە هاووڵاتی پابەند بە یاسا، تا ئێرە ئەوەی باسکرا پرۆسەیەکی پیرۆزە و لە خزمەت مرۆڤایەتی دایە، بەڵام ئەوەی بابەتی ئێمەیە ئەوەیە مرۆڤ بێ هیچ تاوانێک بخرێتە کونجی زیندان و بە چەندین شێواز و ڕێگای وەک (کارەبا لێدان، زمانبڕین، سێدارە، شکاندنی دەست و قاچ، برسیکردن، تێنووکردن، لە هاویندا بردنە بەرهەتاو و لە زستاندا بەردەم ساردی و فەلاقە و سوکایەتی پێکردن و جوێن پێدان تا دەگاتە لاقەکردن و ئەتککردن و ... تاد ئازار و ئەشکەنجە بدرێت) هەموو ئەمانە تەنیا لەبەر ئەوەی دەسەڵاتی بەرانبەر کە دیکتاتۆرە و ئەوەی دیکەی وەک نەتەوە یان ئایدیا قبوڵ نییە .. ئەم حاڵەتەش بە درێژایی مێژوو لە هەر چوار پارچەی کوردستان بەسەر

نەتەوەی کورد دا هاتووە. دیارە مێژووی پڕ لەزیندانیی کورد جگە لە لایەنی مێژوویی، لەنێو ئەدەبیش پانتاییێکی بەرچاوی گرتووە، شاعیرانمان لەم بوارە پێشەنگن، ئەوجا ژانری دیکەی وەک چیرۆک و ڕۆمانیش هەڵگری ئەم ئازار و مەینەتییەن، دیاریشە هەموو ئەمانە بە دانەبڕاوی ئاوێزانی هونەر بوونە چ لەڕێی دەنگبێژی وەک (شڤان پەروەر و محەمەد جەزا و ...هتد) پێشکەشکراون، چ وەک سیناریۆی شانۆیی و فیلم و دراما بەرهەمهێنراون، وەک فیلمی (هەیئە و ژانی گەل) یان درامای (گەردەلوول) و..تاد.

هەموو ئەمانەش بەرهەمی ئەو زیندانە نەگریسانەن دەیانویست ناسنامەی کورد بسڕنەوە بە زیندانیکردنی خەڵکانی بێتاوان و نیشتمانپەروەر .. لەپاڵ ئەمەش ئەنفالکردن، ئەگەر ناوی بەشێک لە ناودارترین زیندانەکانیش بێنم:(زیندانی دیاربەکر، نوگرەسەلمان، ئەبوغرێب و زیندانی هەیئە) کە ترسناکترینن و هاوشێوەی زیندانە تاریکەکانی جیهانن.

بۆیە لێرە زیندان بۆ کورد شوێن و وێستگەی دابڕین و لێسەندنەوەی ئازادی و دابڕان لە دونیای دەرەوەی مرۆڤی کورد بووە، بەئامانجی تێکشکاندن و فەوتاندن و داماڵین لە کەسایەتی و مرۆڤ بوون.

لەوەتەی مرۆڤ هەیە، تێکۆشانیش بەدوای ئازادیدا هەیە و هاوتەریب زیندانیش هەیە، مرۆڤی کورد هێشتا لەناو بێدەرەتانی ئەو چارەنووسە دایە بە هەموو شێوەکانییەوە، زیندانی بەکۆمەڵ و زیندانی تاک. کورد جگە لە چەشتن و تاقیکردنەوەی هەموو جۆرەکانی زیندانیکردن. بێ جێیی نییە ئەگەر بڵێم لەوەتەی کورد هەیە زیندان هەیە و هەوڵی ئازادی سەندنەوە لە کورد هەیە!. هەر بۆیە دەبێت لە ئەدەبیاتی کوردی (زیندان) وەک لقێکی تایبەتی ئەدەب سەیر بکرێت،

نەک پەراوێز..! چونکە ئەگەر پێشمەرگە لەشاخ سەنگەری لە دوژمن گرتبێ ئەوا لە مێژووی ڕزگاریی نیشتمانییدا زیندان سەنگەرێکی دیکەی بەرەنگاربوونەوەی دوژمن بووە.

ئەوجا لە جیهاندا ڕۆمان و چیرۆک و نووسینەکانی دیکەی دەربارەی زیندان زۆرن، هەڵبژاردەی نامەکانی زیندانی گرامشی، زیندانییەکی بێ ناوی ماندێلا، بیرەوەرییەکانی ژنێکی زیندانی نەوال سەعداوی، لای شاعیران و نووسەرانی کوردیش دەق و باس و خواسی زیندان زۆرن، بۆ نموونە: شەهید مەلا عەلی لە بەشی سێدارەی زیندانی مووسڵەوە بە کوردییەکی ڕەوان چارەنووس و بەرگرینامە و دۆخی زیندانی هۆنیوەتەوە و دەڵێت:

مەرگی ئاوا ناگۆڕمەوە بە سەد ژین
ژینێک سەرم بۆ دوژمن بێ بە پەرژین
سەربەرزییە کە پێڵاوم ئەبینن
بەسەر سەری دوژمنەوە لە بەرزین..
...........
برا دوور و خزم دوور و کەسم دوور ..
بە نابەڵەد تەمەن ئەمبا بەرەو ژوور
بەڵام ڕوونە .. بەرەو سێدارە چوونە ..
خەنەی خوێنم لە پێگرێ ئاڵای سوور.

ئەم باسە کورتە بە ناوهێنان و دەستگیرکرانی (سەلاحەین دەمیرتاش) کۆتایی پێدێنم، زیندانیکردنی ئەو لاوە میانڕۆیە جوامێرەی کورد لە تورکیا، ئاماژەیە بۆ زیندانیکردنی نەتەوەیەک بە هەموو ژانرەکانی ژیانی ئەوەوە بە سیاسەت و چیرۆک و دەنگبێژیی و موزیک و تابلۆ و ڕەنگەوە.

**ئەدەبی زیندانی:**

ئەدەبی زیندان" هەموو ئەو جۆرە دەقانە دەگرێتەوە خاوەنەکەی لە زیندان نووسیویەتی یان دوای ئازاد بوون دەیانگێڕێتەوە و دەیاننووسێتەوە جا چ لە کۆنتێکست و دەقی شیعر بێت یان ڕۆمان و چیرۆک و یادەوەری و .. هتد، گرنگ ئەو هەڵدەستێت بە وەسفکردنی ئازارەکانی ڕۆژانی زیندانی و دەستبەسەری لە شوێنێک کە دژی ویست و ئیرادەی خۆی بووە، پەیام و ئامانجیش لە نووسینەوەی ئەم بابەتانە کە دواجار دەبن بە ئەدەبێکی سەربەخۆ و سەنگین بەناوی (ئەدەبی زیندان) خۆی لە چەند خاڵێکدا دەبینێتەوە، لەوانە: ئازادبوونی نووسەرە لە کۆژان و ئەو ئەزموونە تاڵەی هەیەتی ئەمە لەڕووی دەروونذرووستییەوە بایەخ و گرنگی خۆی هەیە و نووسینەوەی بیرەوەری جۆرێکە لە هەناسەدان و دەرباز بوون لە تەنگی، هەروەها دەربڕینی ئەو دەنگەی نێو" ناخ"ە مرۆڤ ناتوانێت لە ژیانی ڕۆژانەیدا بە گوتن بیانگوازێتەوە، بەڵکو لە ڕێگەی کرداری" نووسین"ەوە ئەم گوشارە دەروونییە کەم دەکاتەوە؛ لەو میانەیەش پزیشکانی دەروونیی جیهانی گەیشتوونەتە ئەو باوەڕەی ئەگەر مرۆڤ ڕۆژانە (بیست خولەک) بۆ نووسینەوەی یادەوەرییەکانی بەبێ چاودێری و سانسۆر تەرخان بکات، زۆر لە کێشە دەروونی و تەنانەت جەستەییەکانیشی چارەسەر دەبن، هەروەها لە گوشارەکانی ناوەوەی خۆی دوور دەکەوێتەوە و ئارام دەبێتەوە، خاڵێکی دیکە ئەوەیە: گەیاندن و هێشتنەوەی ئەزموونی زیندان بەشێوەی نووسراو بۆ بەرچاوڕوونی و تێگەیاندنی ڕۆڵەکانی نیشتمان لەمەڕ هەڵسوکەوتی دەسەڵاتە ستەمکارەکان لەگەڵ خەڵک و هاووڵاتی خۆیدا.

بیرمەندی فەرەنسی (تۆدۆرۆڤ ١٩٣٩_٢٠١٧) لە کتێبی (ئەدەب لە مەترسیدا) دەڵێت: " ئەدەب لە بۆشاییدا نایەتە بوون، بەڵکو لە هەناوی

کۆمەڵە گوتارە زیندووەکانەوە پەیدا دەبێت و خەسڵەتی هاوبەشی فراوانی لەگەڵ ئەو گوتارانەدا هەیە" کەواتە ئەدەب ئەو شتەیە تا هەتایە هەیە و دەبێت، چونکە ئەدەب تەریبە لەگەڵ چۆنیەتی ژیانی مرۆڤ، چ خۆشی بێت گوزارشتی لێ بکات چ ناخۆشی و تەنگەبەری بێت ئازارەکانی بهۆنێتەوە واتە "ئەدەب" دەربڕێت و سەبووری پێ بێت. ئەگەر ئاماژەیەک بە ئەدەبی زیندانی گەلانی جیهان بدەین ئەوا دەبێت بڵێین نموونەی دیار و زەقی ئەم بوارە کتێبی (عزاء الفلسفة)ی (٤٨٠_٥٢٤) "بوثیوس"ە، کە لە چاوەڕوانی رۆژی دادگاییکردنەکەی نووسیویەتی و لەسەر ئاستی جیهانی بە نموونەی بەرزی "ئەدەبی زیندانی" ناودەبرێت، تێیدا فەیلەسوف و سیاسەتمداری دەوڵەتی ڕۆمانی "بۆتیوس" بە تۆمەتی ناپاکی و بەرگریکردن لە کەسێک پێشتر سەرۆکی کونسلیە بووە، ئیدی سێ کەسی نێو دەسەڵات لەدژی گەواهی دەدەن و بەناپاک هەژماری دەکەن، دوای ئەوەی ساڵێک لە زیندان دەمێنێتەوە دواجار بەبڕیاری مەلیکی قیبتییەکان لەسێدارە دەدرێت. هەروەها نووسەری ئیتاڵی دانتێ ئەلیگری (١٢٦٥_١٣٢١) شاکاری (کۆمیدیای خواوەندی) لە مەنفا و لە نێو کۆمەڵێک ئازار و مەینەتیی دوورخراوەیی نووسی .

هەروەها نووسەری گەورەی ئیسپانی (میگویل دی سێرڤانتێس١٥٤٧-١٦١٦) ئەو نووسەرەی پێنج ساڵ لە جەزائیر زیندانی بوو، لە ساڵانی (١٥٧٥-١٥٨٠)، هەر لەو ماوەیە لە زیندان و دەستبەسەریدا ڕۆمانە ئەفسووناوییەکەی بەناوی (دۆن کیشوت) نووسی، ئیدی ئەویش بەو هۆیەی ئەندامی کۆمیسیۆنی -ئەرمادا- بووە، کەوتۆتە بەر نەفرەتی کڵێسا، سەرباری ئەوەش فەرمانبەری باجگریی و کۆکردنەوەی "داهات" بووە، زۆرجاران بە تۆمەتی دزی و دەستپیسی زیندانی کراوە و وەک پیاوێکی قەرزار لەپشت قەفەسە

ئاسنینەکانەوە ژیانی بردۆتەسەر و بەنابووتی و هەر لە نەبوونیشدا سەری ناوەتەوە. هەروەها ڕۆمانی (شرق المتوسط)ی نووسەر و ڕەخنەگری سعودی (عبدالرحمن منیف ١٩٣٣_ ٢٠٠٤) باسی دۆخی گیراوەکان دەکات لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەبێ دەسنیشانکردنی ناوی کەس و ناوی هیچ وڵاتێک کە تێیدا زیندان ئەشکەنجە و ڕەفتاری سەرکوتکەرانەی تەواو قێزەونی دژەمرۆڤانەی تێدا دەکرێت. هەروەها نووسەر و ڕۆماننووسی گەورەی ئێرانی (بوزورگی عەلەوی ١٩٠٤_١٩٩٧) لە ڕۆمانی (پەنجاو سێ کەس)دا باس لە ئەزموونی حەفت ساڵ زیندانیی خۆی و هاوەڵەکانی دەکات و شاکارێکی ئەدەبی جوانی لێ بەرهەمهێناوە. هەروەها ڕۆمانی (ساڵێک لە دۆزەخ)ی نووسەر و شاعیری کۆچکردوو (مەهاباد قەرەداغی ١٩٦٦_٢٠٢٠) باس لە ئەزموونی ساڵێکی تەمەنی دەکات کە چۆن بەهۆی بیر و باوەڕی نەتەوەیی دەکەوێتە بەر زەبر و زەنگی زیندانەکانی حزبی بەعسی فاشیستی ئێراقی. هەروەها ڕۆمانی (القوقعة)ی نووسەر و ڕۆماننووسی سووری (موستەفا خەلیفە) یادەوەری ڕۆژەکانی نێو زیندان دەگێڕێتەوە، چۆن لەلایەن ڕژێمی سووری دەگیرێت بە تۆمەتی هەبوونی پەیوەندی لەگەڵ (کۆمەڵەی ئیخوان موسلیمین) لە کاتێکدا خۆی کەسێکی مەسیحییە و هیچ پەیوەندییەکی بە ئایینی ئیسلامەوە نییە! کەچی ١٣ساڵ لەژێر چەندین ئەشکەنجە بەرگە دەگرێت بێ ئەوەی  هیچ تاوانێکی هەبێت تا دواجار بەناچاری لە بێبەڵگەیی تاوانبارییدا ئازادی دەکەن.

ئەگەر بێینە سەرباسی ئەم بابەتە لەنێو ئەدەبی کوردی، ئەوا یەکێک لەو کەلێنانەی لە ئەدەبی کوردیدا من دەیبینم و دەمێکە دەمەوێت بیکەمە چەقی گرینگیپێدان و کارلەسەرکردنم، ئەویش ئەم ئەدەبە تایبەت و بێنازەیە: (ئەدەبی زیندان) کە بەداخەوە زۆر لاواز و

فەرامۆشکراوە لەچاو ئەدەبی زیندانی نەتەوەکانی دیکە؛ لە کاتێکدا مێژووی هاوچەرخی کورد بەشێکی دانەبڕاویی زیندانییە، بە سەدان قارەمانمان لەسێدارە دراون، ئەمە بۆ هەر چوار پارچەی کوردستان دەتوانم بڵێم گشتگیرە، بۆیە گرنگی پێدانی هەم ئەرکێکی نیشتمانییە هەم برەودان و دەوڵەمەندترکردنی ئەدەبەکەمانە کە لایەنێکی هەرە گرنگی خۆناساندنە بە گەلانی جیهان، لەو نێوەندەدا بەندە وەک خزمەتێکی بچووک و وەفادارییەکیش بۆ هەموو ئەوانەی ڕۆژێک لە ڕۆژان لە کونجەکانی زیندان بەهۆی بیری نەتەوەییان مەحکووم کراون، دەمەوێ لەڕێگەی ئەم لێکۆڵینەوە فرەڕەهەندەوە ڕووە و ژانری "ڕۆمان" پێکەوە پێهەڵگرین و بەپانتایی نووسین و تووڵەڕێی تەکنیک و مێرگی ڕووداوە هیوابەخشەکان و پێچی دیمەنەکانیدا بەسەرنجەوە بکەوینە گەشت، لە مەعریفە و بونیاد و پێکهاتەیەوە خۆمان تژی بکەین لە ڕامان و ڕۆنانی دیوە شاراوە و جادووییەکانی "دەق"، هەڵبەتە باسکردن و شیکردنەوەی ئەدەبی زیندانی و ڕۆمان و بنەماکانی وەک کارێکی نیمچە تیۆریی، دەمانخاتە بەر گۆشەنیگا و لێنزی یەکێک لە کارە ناوازەکانی نێو جیهانی (ئەدەبی زیندان)ی کە (رۆمانە) وەک پرۆسەی بە پراکتیزەکردنی بابەتەکەمان، بۆ ڕوونکردنەوە و کاراکردنی ئەدەبەکە، تەنانەت لە ناوەندەکانی خوێندن و فێرکردنیش، بەتایبەت قوتابیانی زانکۆ، بۆ ئەو مەبەستەش دەقێکمان هەڵبژاردووە ناوازە و جیاواز؛ چونکە هەر لە سەرەتاوە وەک دەقێکی "پلۆتدار" خوێنەر نوقمی فەنتازیا و حەقیقەتی ڕووداوەکانی دەکات، لەوێوەش دیاردە و بنەماکانی وەک بومی "جێبەجێکردن"ی روئیاکانمان لەپاڵ بەشێک لە تیۆرە جیهانییەکان و تا ڕاددەیەک بەراوردکردنییان، هەرچەندە من لام وایە هیچ فەلسەفە و تیۆر و نۆرمێکی نووسینی وڵاتانی دیکە پڕ بە پێستی ڕووداو و نووسینەکانی وڵاتی ئێمە نابێ، بەهۆی جیاوازی بار و سایکۆلۆژییەتی

تاک و تێگەیشتنمان بۆ ژیان و تایبەتمەندییە نەتەوەییەکانەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش ئێمە هەوڵدەدەین ئاشنایەتی دروستبکەین، بەپاراستنی کرۆک و جەوهەری بابەتەکەی خۆمان، پاشانیش سەرنج و ئەنجام بخەینەڕوو.

دیارە ئەم دەقەی هەڵمانبژاردووە کۆڕۆمانی (بووژانەوەی ژیلەمۆ)ی نووسەر (سەلام عەبدوڵڵا)یە کە بە نموونەی هەڵوەستە لەسەرکردن و شرۆڤەکاری دەیهێنینەوە.

ئەم کۆڕۆمانە ڕاماندەکێشێتە نێو کۆمەڵێک ڕووداوی جۆراوجۆر و زنجیرەیی (کرۆنۆلۆژی)، هەروەها سیماکانی " گێڕانەوە "و کەرستەکانی پێکهێنانی و زمانی بێ گرێ، لەگەڵ کات و شوێن و خەیاڵ، هەموو ئەمانە پەیوەندی دەلالییان لەگەڵ یەکتر دروست کردووە، هەر لە زیندانیبوونی دووجار و دوو دەوڵەتی جیاواز و ترسناک و بینینی ئازار و ئەشکەنجەی تاقەتپرووکێن تا ڕاکردنی پاڵەوانی ڕۆمان لە زیندان بەجۆرێک بەر لە هاتنی وادەی لەسێدارەدانی .. بەرەو ئاسۆی بەدیهێنانی خەونەکانی و خەباتی نیشتمانی وەک پێشمەرگەیەکی چاونەترس هەنگاو هەڵدەگرێ، هەموو ئەمانە دەمانبەنەوە بەردەم قوتابخانە ئەدەبی و ڕەخنەیی و بەراوردکارییە جیهانییەکان بە تایبەت فورمالیستەی "ڕووس" و ئەدەبە بەرەنگارییە جیاوازەکانی جیهان.

هەروەها فلاشباک و یادەوەری زۆر لە نووسەر و خاوەن شاکارەکان و جێمانی کاریگەرییان لە نێو ڕەوت و کایە جیاوازەکان بەتایبەت ڕەوتی سیاسی، لەوانە: ڕۆمانی" دایک " ئەو ڕۆمانەی (لینین) لەبارەیەوە دەڵێت: ڕۆمانی "دایک"ی مەکسیم گۆرکی چەند ساڵێک شۆڕشی بەڵشەڤیی پێشخست. تەنانەت هەندێک لە ماستاوچییەکان بە ئاماژە و ناوهێنانی کتێبەکەی گۆرکی نازناوی باوکی سۆڤیەتیان بە ستالین بەخشی بوو، دەڵێن: ڕۆژێک ستالین بە گۆرکیی گوتووە:

هاوڕێ گۆرکی تۆ سالآنێک بەر لە ئێستا کتێبی دایکت نووسی، پێت وانییە کاتی ئەوە هاتووە کتێبی باوکیش بنووسیت؟ گۆرکییش گوتبووی: ئەم گەلە هێشتا بێ باوکە! ئیدی ئەم وەڵامە لەسەر دڵی "ستالین" زۆر قورس دەبێت، هەر بۆیە کوڕەکەی مەکسیم گۆرکی بە فێڵ دەکوژن و خۆیشی لە دۆخێکی تەمومژاویدا دەمرێت. هێنانەوە و باسکردنی نموونەکانی نێو ئەدەبی ڕووسی لە لێکۆڵینەوەکەمان هەڵگری ئەو پەیامەیە، ئەگەر بگوترێت هیچ میللەتێک هێندەی ڕووس نووسەران و داهێنەرانیان باجی بەرهەمەکانیان نەداوە، هەندێکیان لە سێدارە دراون، یان خۆیان کوشتووە، یان بۆ دەرەوەی وڵات دوورخراونەتەوە، یاخود بۆ دوورگەی سەرماوسۆڵی سیبریا، یانیش خراونەتە شێتخانەوە. ئەوا نەتەوەی کوردیش هیچی لەوان کەمتر نەبووە و نییە؛ چونکە زۆربەی نووسەرەکانیان لەلایەن ڕژێمە فاشیستەکانی نزیک لێیان باجی گەورە و دژواریان بەرانبەر بە نووسین و بۆچوونەکانیان داوە، لەوانە مێژوونووس (مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی ١٩١٣-٢٠٠١) لەپای هەڵوێستی بوێرانە و سڵ نەکردنەوە و گوتنی ڕاستییەکان، لە ساڵی٢٠٠١ لە ماڵەکەی خۆی لە بەغدا بە شێوەیەکی دڕندانە بە دەستی پیاوانی حزبی بەعسی ئێراقی تیرۆر کرا.

## بەشی دووەم

# پراکتیکی

### ناساندنی ڕۆمانی بووژانەوەی ژیلەمۆ:

کۆڕۆمانی بووژانەوەی ژیلەمۆ پێکهاتووە لە (٦٠٦) لاپەڕە، هەروەک پێشتر ئاماژەم پێیدا ئەم ڕۆمانە لە نووسینی نووسەر و ڕووناکبیر سەلام عەبدوڵلایە و دەزگای ڕۆشنبیریی جەمال عیرفان ساڵی ٢٠٢٢ چاپیانکردووە لە "کوردستانی ـ ئێراق".

### ڕەگەزی ناونیشانی ڕۆمانەکە:

ناونیشان و دەق لەهەر ژانرێکی ئەدەبی بەتایبەتی، لە هەموو کایە جیاجیاکانی ژیان و تەنانەت منداڵێکی تازە لەدایکبوو، لە هەموو شتێک زیاتر سەرنجی دەخرێتە سەر، ئەوەشی ئێستا ئێمە مەبەستمانە ناونیشانی ژانری ڕۆمانە لە ئەدەبی کوردی، گرینگی ئەم ڕەگەزەش لەوەدایە ناونیشان جگە لەوەی کلیلی داخلبوون و شۆڕبوونەوەیە بۆ ناو ڕۆحی دەق، لە دیوێکی دیکەیەوە کورتکراوەی ناواخن و سیفەتی دەقە، بۆ نموونە لە ڕۆمانی (پێشمەرگە)ی ڕەحیمی قازیی تێدەگەی نووسەر باسی باری ژیانی کوردەکانی ئێران دەکات، چۆنیەتی مامەڵەی نێوان دەرەبەگ و وەرزێر، زەبروزەنگی میری، پشتیوانیی شۆڕشی مەهاباد لەلایەن هەموو تیرە و چینەکانی کوردستانی ئێرانەوە دەردەخات.

یاخود ڕۆمانی (شڤانی کوردا)ی "عەرەبێ شەمۆ" (شامیلۆڤ) لە ناوەکەی دیارە ئەم بەرهەمە ژانرێکی مێژوویی و کلتوورییە دەلالەت لە ژیان و گوزەرانی خێڵەکی و کۆچەریبوونی ئەو سەردەمی کوردان دەکات، بەگشتی تێم و مژاری ڕۆمانەکە چینایەتییە و بەرهەمی سەردەمانی ئاڵوگۆڕی نەرین و نەرێتی کۆمەڵگایەکی فیۆداڵە و ئاغا و ڕەعیەتییە و باندۆری سیاسەتی ئەو کاتانەی بە سەرەوەیە.

شوانی کورد بەرهەمی ژیانی نووسەرە و نوستالۆژییەکی داڕێژراوەی ئەدەبی سەردەمانی شۆڕشی ئۆکتۆبەری سۆڤییەتە. لە ساڵی ١٩٣٥ی زاینی لە ئێریڤان چاپ و وەشان کراوە و بە شاهێدی زۆر نووسەری کوردی و بیانی وەک یەکەمین ڕۆمانی کوردی دەناسرێت.

هەروەها ئەگەر بێینە سەر باسی ناونیشانی کۆڕۆمانی (بووژانەوەی ژیلەمۆ) ئەم ناونیشانە بەتەنیا هەرخۆی وەک پەیامێکی نەمریی و بەردەوامیی خۆی پێمان ئاشنا دەکات، ئاخر بووژانەوە ژیانەوەیە لەپاڵ ئەوەی دوژمن هەموو ڕێگایەک دەگرێتەبەر بۆ لەناوبردنت، ژیلەمۆیش ئاگری ژێر خۆڵییە، ئەی ئەوە نییە هونەرمەند نەجمەی غوڵامی دەڵێت:

(من پشکۆییێک لەو ئاگرەم کە ئاسنیش ئەتاوێنێ
من دڵۆپێک لەو بارانەم کە دەریایەک بەدی دێنێ
من شەماڵم .. ئەو شەماڵەی پڕ لە شنەی بەسۆز و تاو
دەمەو بەهار بەفری داگیرکەری وڵات ئەکەم بە ئاو
من ژیلەمۆم ئەو ژیلەمۆی دوای هەزاران ئاو لێپژان
دیسانەوە گڕ دەهاوێم ئەیلێمەوە گۆرانی ژیان... هتد)

**بابەتیبوونی پاڵەوان و شوناسی ئافرەت لە دەستپێکی ڕۆمانەکە:**

بابەتیبوونی "پاڵەوان" لەم ڕۆمانە دوورە لە پیاهەڵدان و نمایشکردنی خود، ڕاستەوخۆ و سرووشتیانە دەچەسپێتە بیرکردنەوە و ڕوئیای "وەرگر " یاخود خوێنەر؛ چونکە هەرزوو لێکدانەوە ویژدانی و ئەخلاقی و فیکرییەکان دەبنە مۆتیڤێکی هەرە باڵا بۆ ئەم جۆرە پاڵەوانانە، بۆیە لەگەڵ یەکەمین هەنگاوی "گێڕانەوەکە" و لە پاڵ هەبوونی فەراغی ناساندنی پاڵەوانەکەش کەچی درک بەوە دەکرێت نەخشەی ژیان و بیۆگرافیای پاڵەوان بریتییە لە کەسایەتییەکی "شۆڕشگێڕ و نەتەوەیی" هەر بۆیەشە ئەو دەمێکە لە ترسی جەللادەکانی دەسەڵات لە ماڵەوە نابێت و بۆ پاراستن و پەرەسەندنی خوولیاکەی، کاری "سیاسیی نهێنی" لە ژێرزەمینی ماڵی هاوڕێیەکی ماوەتەوە، هەروەک لە دەستپێکی ڕۆمانەکە هاتووە: (کە کلیلی دەرگای ماڵەوەم وەرچەرخاند ئەوسا زانیم چ هەڵەیەکی گەورەم کردووە و نەدەبوایە بگەڕێمەوە ...نا...بەڵام تازە کار لەکار ترازابوو، چونکە هەرگیز نەمدەتوانی بەم شەوە درەنگە بڕۆمەوە ئەو ماڵەی لەم مانگەی دواییدا ببووە حەشارگەو شوێنی حەوانەوەم... هتد ل٩ ) لەم ڕووەوە وردەکارییەکانی دەقەکە زۆر بابەتییانە دەست پێدەکات، پاڵەوانیش پێشوەخت ئەو یەقینەی لا دروست بووە مەسەلەکە ئاسان نییە و دەرئەنجام ڕووبەڕووی چەندین نارەحەتی و کێشە دەبێتەوە؛ چونکە باش دەزانێت هێزی دەسەڵاتی چەوساندنەوە و خنکاندنی "ئازادی" خەو ناچێتە چاوانیان و بەردەوام فۆکسیان لەسەر کەسانێکە دژیان بوەستنەوە، بەڵام ئەم سەرکێشی بە گیانی خۆی دەکات و دەگەڕێتەوە ماڵ. کاتێک بمەوێت شەنوکەوی دەقێک بکەم پێویست دەکات بەرەو ئاڕاستەیەکی زۆر گرنگی لێکۆڵینەوە هەنگاو بنێم، ئەویش مەنهەج و بۆچوونەکانی بیرمەندان و خاوەن تیۆر و مەنتقگۆیانە لەپاڵ تێبینی و سەرنجەکانم؛ بۆیە لێرەدا بە بیرمەندی

فەڕەنسی (ژاک دێریدایە١٩٣٠_٢٠٠٤) کە تەریبی ئەو سەردەمەیە دەست پێدەکەم، ئەو پێی وایە (هەوڵدان بۆ هەڵوەشاندنەوەی دەقەکان و نزیکبوونەوە لە تێگەیشتنیان دەمانخاتە بەردەم ڕوانینی هەمەلایەنەتر بۆ باوەڕهێنان بەوەی لە هیچ دەقێک دوا مانا و یەک تێگەیشتن مەوجود نییە بەڵکو هەموو دەقێک فرەمانایی لەخۆ دەگرێت، بە پشتبەستن بە گرنگی ڕاڤە و ڕاڤەکاری.) بۆیە دەکرێت لێرەدا وەک خوێنەرێک ئەو تێگەیشتنە بخەمە ڕوو، دوای ئەوەی پاڵەوانی ڕۆمانی هەیئە دەرگای ماڵەوەیان دەکاتەوە و دێتە حەوشە دەبینێت دایکی بەتەنیا لە حەوشەکەیان ڕاکشاوە و جێگایەکیشی بۆ ئەو لەنزیک خۆیەوە ڕاخستووە! لەو کاتەدا سەری دەسووڕمێت ئاخۆ دایکی چۆنی زانیوە ئەمشەو ئەو دەگەڕێتەوە ماڵ! هەروەک دەڵێت: (سەیر بوو لام! لەسەر جێگاکەم بە ئەسپایی پاڵکەوتم، سەرنجی ئاسمانم دەدا ئەستێرەکان یەکجار گەش دەهاتنە بەرچاوم، جا لەبەر ئەوە بووبێت ماوەیەکی زۆربوو لە ژێرخانی ماڵێکدا دەنووستم، ئەو مۆڵەتەم بۆ نەدەڕەخسا ئاسمان ببینم یان هەرخۆی شەوەکەی "ئەو سەرەتای مانگی ئابی حەفتاو حەفتە" وەک دەڵێن: ئەنگوستەچاو بوو! ... هتد ل٩ – ١٠) ڕەنگە بڵێن: باشە لەنێو ئەم هەموو ڕووداو و قۆناغانەی دێنە پێش لەم" کۆڕۆمانە "بۆچی بەم پەڕەگرافە سەرەتایەت گرتووە! بەڕێزان: لە میتۆدی "سیاقخوازی" ژیانی تایبەتی نووسەر گرینگیی تەواوی پێدەدرێت، بە سیفەتی ئەوەی بەرهەمهێنەری ڕاستەقینەی دەقەکەیە و دەسەڵاتی تەواوی هەیە و دەبێت حیسابێکی زۆری بۆ بکرێت، نەک تەنیا لە دەوری "تێکستخوازی" بخولێینەوە، بەدڵنیاییەوە ئەویش گرنگی خۆی هەیە و زیاتر لە وردەکاری و نهێنییەکانی خودی تێکستەکە ورد دەبێتەوە، بە دابڕاوی لە ژیانی تایبەتی نووسەرەکەی، زۆرتر بایەخ بە لایەنی زمانەوانی و بونیادی زمان و هەروەها لایەنی ئیستاتیکی دەدات.

هەر ئەمەش وایکرد چەمکی  "مەرگی نووسەر" لە ڕەخنەی ئەدەبیدا سەرهەڵبدات کە ڕەخنەگری فەرەنسی (ڕۆلان بارت ١٩١٥_١٩٨٠) داهێنەریەتی، بەڵام ئێمە هەوڵدەدەین هاوسەنگی ڕابگرین لەنێوان (کۆنتێکست و تێکست) هەم بایەخ بە نووسەری ڕۆمان دەدەین هەمیش بە دەقی ڕۆمانەکە،لەدیوێکی دیکەی بیۆگرافیای پاڵەوانی کوڕۆمانەکە کە خودی نووسەر خۆیەتی ئەوەیە کاتێک دایکی لە خەوەکە بەئاگادێت بەم شێوەیە دایڕشتووە: کە دایکم بەتانییەکەی لەسەر ڕووی خۆی لادا و بە دەنگێکی خەواڵووەوە وتی: چۆن بوو...؟ مەبەستی گەڕانەوەم بوو، ڕاستی دەکرد، بەڵام منیش بەسەر سووڕمانەوە وتم: دایە چۆن زانیت ئەمشەو دەگەڕێمەوە؟!

- نەمدەزانی!
- ئەی چۆن جێگەت بۆ ئامادەکردم؟!
- من هەموو شەوێک جێگەت بۆ ڕادەخەم.
- ئەمڕۆ کەس هەواڵی پرسیم ؟
- نا (ل١٠).

کاتێک دیقەتی حیواری نێوان ئەو دایک و کوڕە دەدەی، هەر زوو هەست بەچەند بابەتێک دەکەی، بۆ نموونە: وەڵامەکانی دایکەکە پڕن لە هەست و نەست بەڵام "گێڕەرەوە "هیچ وەسفێکی نەداوەتێ لەکاتێکدا ئەو دایکە و هەموو دایکەکانی "کوردستان " بەدیاریکراویش دایکە "پێشمەرگە " و دایکی ئەو کوڕ و کچانەی هەڵگری بیر و باوەڕی جیای نەتەوایەتی و ڕەتکردنەوەی زوڵم و زۆرداری ڕژێمە دەسەڵاتدارەکانی ئێراق بوون، هەمیشە دڵبەژانی خەمی منداڵەکانیان بوونە. هەر وەک دایکی نووسەری گەورەی جیهانی "مەکسیم گۆرکی" چۆن لە خەمی کوڕەکەی دادەبێت هەر لەو کاتەی دەستگیر دەکرێت و دەخرێتە "زیندان" ئەمیش دوای کوڕەکەی هاموشۆی هاوڕێکانی کوڕەکەی

دەکات، دەبێتە بەشێک لەو شۆڕشەی کلّپەی دەسەند، ئەمە گۆرکی زۆر بەوردی لە ڕۆمانەکەی بەناوی (دایک) باسی دەکات، بۆیە دەکرا " نووسەر" زیاتر وەسفی دایکی بکردایە تاوەکو وەرگر وا هەست نەکات لەنێوان "دایک و کوڕ" کە مانگێکە لێک دابڕاون، خەیاڵ و عاتیفەی سارد و بێ جوولەیی زاڵە، بەتایبەت دیمەنەکە بە خەولێکەوتنەوەی دایکی کۆتایی دێت؟! ئەوە جگە لەوەی دەیتوانی لە بارەی زەمەنەوە سوود لە ڕەگەزی "فلاش باگ" وەربگرێت، لە باسکردنی هەندێک سەرەتای ژیانی و وەسفکردنی خودی خۆی وەک کارەکتەری سەرەکی نێو ڕۆمانەکە، لە ڕووی وەسفی ناوەکی و دەرەکی، چونکە بۆشاییەک هەست پێدەکرێ، لەوەی خوێنەر نازانێت لە خەیاڵدانی خۆی چۆن وێنای کەسایەتی پاڵەوانەکە بکات! ئایا ڕووخساری چۆنە و چ پۆشاکێکی لەبەر بووە، چ ڕەنگێکی پۆشیووە، بەتایبەت بۆ نووسینەوەی ڕۆمان لاموایە بۆ نەوەی ئەمڕۆ زۆر پێویست بوو، ڕۆمانێک دەخوێنێتەوە باس لە ڕووداوگەلی چارەکی کۆتایی سەدەی ڕابردوو دەکات، دەکرێت ئەم وەسفکردنە هاوکات ببێتە پێشاندانی بەشێک لە خولیا و دابی ئەو سەردەم .. ئاخۆ گەنج و لاوان چییان پۆشیووە و حەزیان بەچی بووە، لە خواردن، لە ڕەنگ، لە خۆشەویستی، هەروەها تەنانەت لە موزیک و سەیرکردنی فیلم و کتێب خوێندنەوە، هەموو ئەمانە دەبنە بەشێک لە شووناس و پێکهاتەی پاڵەوان و کارەکتەرەکانی دیکەی نێو گێڕانەوەکە، ئەوسا دەزوویێکیش دەبێت بەدەست خوێنەرەوە بۆ چنینەوە و نەخشکردنی وێنە و پێکهاتەی کارەکتەرە ناوەندیی و کۆمپارسەکان، ئەم بەرچاوڕوونییە بۆ خوێنەر گرینگە چونکە ئەو لە ساڵی خۆی و واقیعی حاڵی خۆی نامێنێ دەچێتە خزمەت "کات"ی ڕۆمانەکە و دەبێتە بەشێک لێی، ئێ خۆ فەلسەفەی ڕۆمانیش وازیکردنە بە "کات"، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم کێماسی

و کوورپییانەی باسمان کرد، بەهۆی گەورەیی ئەو "قەزییە"ی فەزای ڕۆمانەکەی پێکهێناوە، زۆر پێیەوە دیار نییە چونکە وەک جادوویێک خوێنەر بەدوای خۆیدا ڕادەکێشێ و بە قووڵی سەرقاڵی دەکات.

دەنا چەند ساتێک دوای ئەم دیمەنە و بەر لە نووستنی پاڵەوانەکە ئۆتۆمبێلی سەربازەکانی ڕژێم دەوری ماڵەکەیان دەدەن و هەوڵی دەستگیرکردنی پاڵەوانەکە دەدەن، وەک دەڵێت: (هەستابوومە سەرپێ و بۆ ساتێک وڕ بووم، نەمدەزانی چی بکەم، بەڵام لە ناکاودا، بەتانییەکەم کێشا بەسەر چاوی نزیکترین سەربازدا و بەرەو سەربانی دراوسێکەمان هەڵاتم. لەوێشەوە یەکسەر، بازمدایە کۆڵان. ڕاکێشانی میلی تفەنگ و هاواری ڕاوەستە، بێ سوود بوو، من تازە بڕیاری خۆمم دابوو، دەستگیر نەکرێم، چونکە دەمزانی، بەگرتنم چ بەڵایەک بەسەر خۆم و هاوڕێیانما دێ... تاریکی سەربانەکە و چاڵ و چۆڵی کۆڵان، بازدانەکەمی کردە کەوتن، مێشکم کاس بوو، جیهان هێندەی تر لەبەر چاوم تاریک بوو، چەند قۆناغە تفەنگێک بۆ نێو شانم و یەک دوو سەرەنێزە بۆ سەر و چاوم و پژانی خوێن لە لووتم، بەئاگای هێنامەوە سەربازەکان چوار دەوریان دام، یەکێ لەقە و یەکێک بۆکس و یەکێک چەپۆک و یەکێک قۆناغی پێدا دەدام، منیش بەئاستەم خۆم بەپێوە دەگرت، هەستم لای خۆم نەمابوو، دەموچاوێک لێم نزیک کەوتەوە و لاشانی گرتم، وتی: دەمناسی..؟ (ل١١ و ١٢) لێرەدا گێڕەرەوە تووشی هەمان گرفتی پێشوو بۆتەوە، چونکە دووبارە خوێنەر سەرهەڵدەبڕێ و بۆ ساتێک ڕادەمێنی و دەپرسێت باشە ئەی کە ئەو هەموو سەربازە بۆ گرتنی کوڕەکە هاتنە حەوشە و لەولاوەش دابەش ببوونە سەربانەکە: چۆن بوو دایکی هیچ هاوارێک، قیژاندنێک هەڵلایەکی لەتاو کوڕەکەی نەکرد؟! چۆن دەبێت لەم دیمەنە تراژیدیایە سەختە دایکی بێ دەنگ بوەستێت و تەماشا بکات؟ ئەی خۆ ناکرێت بشڵێین لەنێو ئەم هەموو

دەنگی ڕاکێشانی کڵاشینکۆفە دایکەکە هەر نووستوە و خەبەری نەبۆوە! بۆیە دەکرێت بگوترێت: وەسفکردن و فراوانیدان بە گرنگی و پێگەی ئافرەت وەک ڕەگەزێکی تەواوکەری کۆمەڵگا، لەم ڕۆمانە فرە ڕەهەندە کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و دەروونییە گرنگی باشی پێنەدراوە، بەڵکو تەنیا وەکو دایک دەردەکەوێت، لەکاتێکدا دەکرا ئافرەت بە چەند شێوەیەکی دیکەی وردتر بەشداری پێ بکات.

لەگەڵ ئەوەش نووسەر هەوڵیداوە لە باسکردنی جاری دووەمی (ئافرەت) چ وەک دیدار و بینینەوەی دایکی دوای ئەوەی لە دژوارترین زیندانی دوژمن ڕایکردبوو، چ وەک بینین و خۆشەویستیی و نیگاگۆڕینەوەیەکی لەناکاو و بێ ئاکامی کچێک، ئەمەش ئەو کاتەیە کە ڕێی دەکەوێتە گوندێک و لە دەرگای یەکێک لەماڵەکان دەدات، کچێک دەرگاکە دەکاتەوە، ئیدی لەوێدا گرینگی بە مەسەلەی وەسف و دروستکردنی وێنەی درامی کچەکە دەدات، بەشێوەیەک وێنەیەکی تەواو لە خەیاڵی خوێنەر دێنێتە بەرهەم .. وەک لەم چەند پەڕەگرافە بچووک بچووکە دەیخوێنینەوە و وەک نموونەی بەرجەستە دەیانخەینە پێش چاو لە مەشهەدی سەرەتا دەڵێت: (لەناو دێ لامدا و لە دەرگای تەنەکەی ماڵێکم دا، زۆرم تینوو بوو، کچێک دەرگاکەی لێ کردمەوە، پەری بوو؟ ئای چ شۆخێک بوو، یا من دەمێک بوو ئافرەتم نەدیبوو، یان ئەو جوانیکی نائاسایی بوو، بە زەردەخەنەیەکەوە وتی: "فەرموو کاکە ...".

تیشکی ڕۆژ دەیدا بەسەر قژە زەردباوەکەیدا، ڕووی گەش و پەمەیی خوێنی تێزابوو (شەرمی دەکرد)، ملوانکە زیوینەکەی سەر سنگی بریسکەی دەدایەوە.

بەشەرمەوە وتم: "ڕێبوارم... تینوومە".

گوێم لە دەنگێک بوو کە لە هەیوانی ماڵەکەوە وتی: "کێیە خەجاو".

خەجاو (لەو ناوە خۆشە) ئاوڕی دایەوە وتی: «ڕێبوارە... بابە».
(ل١٥٥) لێرەدا زیاتر ڕۆڵی زمانمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە چ ئامرازێکی گرنگی دەربڕینە و پیتیش ئامرازی بەرهەمهێنانی وشەیە وا دەکات مانا و شێوازی تازە و هەمەجۆر دروست بکەن؛ هەروەها فاکتەری بنەڕەت بن بۆ دەربڕینی هەستی دەروون و بەدەنگهێنانی هەرچی هەستەوەرییە، هەروەک لەم شێوازە جوان و ناوازەیەی نووسەردا پراکتیزە بووە، لەلایەکی دیکەوەش ئەم لەگەڵخۆ دووانەی "مۆنۆلۆگ" نووسەر کاریگەری و ئاسەواری گرنگ لە خەیاڵدانی خوێنەر جێدەهێڵێت، کەواتە نووسەری بلیمەت ئەو کەسەیە بە هەردوو شێوازی (مۆنۆلۆگ و دیالۆگ) جێدەستی لە ئەندێشەی وەرگر وەک یادگاری دەهێڵێتەوە، هەموو ئەوانەی گوتمان دەبنە پێناسە بۆ شێواز و تەکنیککاری نووسەر لە داڕشتن و خاوەنداریێتیی سەرفرازانەی دەقێکی تازە. ئاخر کاتێک گێڕەرەوە دێت تەنیا بە گوتنی ڕستەیەک یان چەند وشەیەک کۆمەڵێک تەعریف و بیرکردنەوە و تێگەیشتن لای منی خوێنەر دەخولقێنێ؛ چۆن بتوانم خۆم لەو ڕاستییە لابدەم کە بەڵێ نووسەر بەر لەوەی بنووسێت یان بگێڕێتەوە، بینەر و گوێگرێکی باش بووە، بەمەش خەیاڵفراوانی لەلا دروست دەبێت؛ ئەوەتا خۆتان سەیر بکەن چۆن وێنە و کۆمەڵێک شتی لەکاتی ماڵئاواییکردنی لەم ڕستەیەدا ئەفراندووە و دەڵێت: (لە خواحافیزیدا خەجاو بابۆڵەیەک نانی دایە دەستم و بە سوپاسەوە لێم وەرگرت.

کە ئەم بابۆڵەیە (پارووە نانە) سادەیە چۆن وێنەی کچێکی میهرەبان و خانەدانمان نیشان دەدات؛ پەروەردەی ژیانێکی ڕاستەقینەی کوردەوارییە؛ هاوکات نمەککردن و نیشاندانی ئەو هەستە پاک و خێرایەی خۆشەویستیی نێوان دوو مرۆڤ، هەر ئەمەش وادەکات نووسەر زیاتر پەی بە ڕووداوەکان ببات بەتایبەت تامی ئەو ئازادیی و

هەڵاتنە سەرکەوتووەی لە زیندانی هەیئەی کەرکوک و نیگای گەرم و میهرەبانی کچێک دەڵێت: (هێزێکی سەیر لە لەشمدا پەیدا بوو بوو. هەنگاوی گورج و پتەوم دەنا. ئازادی بەتەواوی خەریک بوو لەبەر دەممدا بەرجەستەبێ. چاوە گەشەکانی خەجاو دەهاتە پێش چاوم. (خۆشی دەویستم؟ل١٥٨). لێرە دەکەوینە یادی "سارتەر" لەم بارەیەوە کاتێ باسی فلۆبێر دەکات و دەڵێ: فلۆبێر هەموو شتێک نائاسایی دەکات و ڕووداوە سادەکانی ژیان دەگۆڕێ بۆ چاوگی سەرسوڕمان...) نووسەری ئەم ڕۆمانەش تیشکی زێڕینی کۆمێنتەکەی سارتەری بەرکەوتووە، لە چەند دیمەن و جوولەیەکی (خەجاو)ی شۆخ و شەنگ مەشهەدی ئەوینێکی بێدەنگ و سەنگینی نەخشاندووە .. دواجار خۆی و خوێنەر لە هێلانەی ئەوینێکی شاپەڕ سپیی و تژی پرسیار جێدەهێڵێت و دەڵێت: (ئەگەرچی هەتاوی گەرمی نیوەڕۆ ڕاستەوخۆ دەیدا لە تەوقی سەرم و چین چین عارەقم هەڵدەڕشت، کەچی هیچ هەستم بە گەرما نەدەکرد. بەپەلە و خێرا هەوراز و نشێوم وەک یەک دەبڕی. خەیاڵم هەر لای (خەجاو) بوو، تۆ بڵێی ڕۆژێک بێت و ڕێگەم بکەوێتەوە دێیەکەیان و بەدیداری ئەو شۆخە شاد ببمەوە؟ ل١٥٨.

دوای ئەوەی پاڵەوانی ڕۆمانەکە لە سەرەتاوە دەستگیر دەکرێت ئەشکەنجەیەکی زۆری دەدەن، دواجار بڕیاری لەسێدارەدانی دەدرێت و چەند ڕۆژێک بەر لە جێبەجێکردنی بڕیارەکە بەپلانێک لەگەڵ ژمارەیەک هاوڕێی لە زیندان هەڵدێن، (ئەم بابەتە لە بەشی داهاتووی نووسینەکەم تاوتوێ دەکەم)، ئیدی بەپەلە دەیەوێت سلێمانی جێبێڵێت و ڕوو بکاتە شاخ بۆ گەیشتن بە ئومێدە لەمێژینەکەی .. پێشمەرگایەتی و وەستانەوە دژی دیکتاتۆریەتی ئیراق، ئەوجا ئەوەی جێی سەرنجی سۆرانی پاڵەوان دەبێت، ئەوەیە لەو ماڵەی تێیدا خۆی حەشارداوە، خاوەن ماڵەکە

وەختێک پێی دەڵێت ئێستا کەسێک هاتووە و میوانی تۆیە! بەدڵنیاییەوە ئەم قسەیەی پێ خۆشنابیت چونکە نەیویستووە کەس ببینێت، هەروەک دەگێڕێتەوە بۆمان: (وەڵامم بۆ دایکم نارد، بەجۆرێک کە تێبگات من دەرباز بووم و لە شاریش نەماوم. نەدەبوو لە چەند کەسێک زیاتر بزانێ کە لە شارم، نەتەنیا لەبەر خۆم، لەبەر ئەوماڵەی لێی دەبووم.

چەند ڕۆژێک لە شار بووم، پەیوەندیم بە کەسەوە نەدەکرد، دەمویست تا دەتوانم شوێنی حەوانەوەم بەنهێنی بپارێزم. شەوێک خانەخوێیەکەم لە دەرگای ژوورەکەمی دا و وتی: "میوانێکت هاتووە، دەیەوێ بتبینێت"

میوان؟ منێ کە حەزم نەدەکرد کەس ببینم، دڵی خانەخوێیەکەم نەشکاند و هاتمە دەرێ. لە هەیوانی ژوورەکە ژنێکی عەبا بەسەر دانیشتبوو. کە سەری هەڵبڕی، دایکم بوو، ئای چۆن پەلاماری دام، گریان و خۆشی تێکەڵ بوو، باوەشی پێدا کردم، گوێم لە تەپەی دڵی بوو، قسەی بۆ نەدەکرا، بەری نەدەدام و وەک بڕوا نەکات وتی: "ئەوە تۆیت؟"

دڵم پڕ بوو، دەبێ چ ئازارێکی دایکم دابێ، دەبێ لەو کاتی گیرانەمدا وەزعی چۆن بووبێ. کە دەستەکانیم ماچ کرد وتم: "بۆ هاتیت؟"

خانەخوێیەکەم بەسەرزەنشتەوە سەیری دەکردم. دیار بوو ئەو هێنابووی. ئەگەرچی کارێکی زۆر ترسناک بوو، بەڵام دایک، تەنیا دایک لە هەستی یەکتری دەگات.

کە دایکم بەجێی هێشتم، زۆر سوپاسی ماڵەکەم کرد و هەر ئەو شەوە بەپێ و بەتەنیا بەکۆڵانەکانی شاردا، خۆم گەیاندە ماڵە دۆستێکی ئەندازیارم.

تەواو لەش و تەندروستیم هاتبووەوە شوێن خۆی و ئامادەگیشم نیشان دابوو کە بچمە دەرێ و ببمە پێشمەرگە ل١٦٧). ئەمجارەیان

نووسەر باشتر وەسفی دیداری دایکی دەکات، بەشێوەیەک نەک هەر خوێنەرێکی ئاسایی بەڵکو چاوێکی ڕەخنەییش ناتوانێت بێلایەن بێت و بە چەند دڵۆپە ئەسرینێک نەچێتە خزمەت دڵی سووتاو و بێ قەراری دایکە پێشمەرگە و خەباتکارێک، وێناکردن و کێشانی وێنەی لەفزی (ژنێکی عەبابەسەر دانیشتبوو، کە سەری بڵند کرد دایکم بوو؛) بە ڕیشە و فلچەی وشەی نێو خەیاڵ و خەمدانی دڵی کێشاویە، پێمان دەڵێت: نووسەری بەسەلیقە وەک شێف وایە شێف هەرکە تامی خواردنی دەستڕەنگینیت کرد، ناتوانیت جارێکی دیکە نەچیتەوە هەمان ڕیستورانت و چێژ لە نان خواردنی دووبارەی دەستی هەمان شێف نەکەیت، خوێنەریش ئاوا بەدوای چێژی خوێندنەوەوەیە هەر هێندە پەی بە جوانناسی گێڕانەوەناسی نووسەرێک یاخود شاعیرێک برد ئیدی ناتوانێت خۆی لەو چێژی خوێندنەوەیە بێ بەش بکات؛ بەڵکو هانی هاوڕێ و کەسانی دیکەش دەدات بۆ خوێندنەوەی.

**شێوازی لێکۆڵینەوە و ئەشکەنجەدان لە (هەیئە – گەڤەڕ)**

زیندانەکانی ئەمن، ئەمنی تایبەت، ئیستیخبارات و موخابەرات، زیندانە نهێنی و ئاشکراکانی دەوڵەتی ئێراق، کۆمەڵێ شوێنی ترسناک و تۆقێنەر بوون، بۆ ئەشکەنجەدان و تەفروتوناکردنی مرۆڤ.

گرتن، لێدان و ئەشکەنجەی جەستەیی و دەروونی، ژێرپێ خستنی کەرامەتی مرۆڤ، لە بەندیخانەکانی وەک: هەیئەی کەرکوک، ئەبوغرێب، ڕەزوانییە، نوگرە سەلمان، قەسابخانەی موسڵ و شوێنە جیاجیاکانی ناوەڕاست و خوارووی عێراق پەیڕەو دەکرا.

هەروەک لە کتێبی (ڕەشەبای ژەهر و ئەنفال)ی عەبدوڵا کەریم مەحمود، بە باشی ئاماژەی پێدراوە، ئەڵبەتە کاتێکیش دەگەڕێینەوە نێو فەزای ڕۆمانەکە ئێستا پاڵەوانەکەی کەوتۆتە دەست دوژمن و هەر

لەسەرەتای لێکۆڵینەوە دوور لە هەموو یاسا و سیمایەکی ئینسانی، بە چاوسوورکردنەوە و هەڕەشە دەستیان پێکرد؛ هەروەک نووسەر ئاماژەی پێداوە دوای ئەو هەموو ڕاکردنە لە دەستییان کەچی دواجار دەستگیری دەکەن و بەرەو زیندانی دەبەن، دەڵێت: (لەسەر کورسییەک دایاننام، پەڕۆی سەر چاویان لابردم، خوێن هەر بە تەوژم لە لووتم دەهات، کەس گوێی نەدامێ، مێشکی سەرم دنگەی دەهات. چۆن ئەمشەو گیرام...؟ ڕاکردنە سەرنەکەوتووەکەشم سبەینێ دەبێتە بەڵگە، بۆ ڕامکرد...؟ چۆن مرۆڤ لە سی چل سەرباز دەرباز دەبێت. بەخێرایی سەیری ئەملا و ئەولای خۆم کرد. چوار دەورم بەسەرباز گیرابوو، ئەفسەرێک لە لای چەپەوە لە ژوورێک هاتە دەرێ و شانی ڕاتەکاندم و وتی: تۆیت سۆران...؟ تۆزێک وەستا، پاشان وتی: سۆران ئەحمەد.

بۆ ماوەیەک ویستم خۆم گێل بکەم، بەڵام بێ سوود بوو، دیار بوو ئەوانە ئەیانزانی کێم، گەر نا بۆ دەیانگرتم، لە وەڵامدا وتم: بەڵێ... ئەوم...

ئەفسەرەکە ڕووە و ژوورەکەی ڕۆیشت و دەرگاکەی کردەوە، یا ئیلاهی کێم دی...

یەکێک لە هاوڕێیانی خۆم بوو، عومەر خەیات... بوو.

لە سەرەتادا بڕوام نەکرد بەڵام کاتێک ئەفسەرەکە بەسەریدا قیژاند و وتی: ئا ئەمەیە؟. هاوڕێکەم دەستی لە پشتەوە بەسترابوو، سەر و پۆتەڵاکی تەواو زەرد هەڵگەڕابوو، نەمزانی ڕەنگی خۆی بوو یان تیشکدانەوەی گلۆپەکەی ژوور سەری بوو. دەمی دەبزواند بەڵام من گوێم لە هیچ نەبوو، دیار بوو لە ژێر ئازارێکی زۆر بوو، لەوە نەدەچوو توانای قسەکردنی مابێت، ئەفسەرەکە قژی سەری گرت و هاواری کرد: لەگەڵ تۆمە لاواز...!!.

هاوڕێکەم لەوە دەچوو بیەوێ سوود لە کات وەربگرێ یان خۆی گێل بکات یان نەیەوێ دەستنیشانم بکات، بەڵام وا دەرنەچوو، چونکە پاش ساتێک سەری ڕەزامەندی بۆ ئەفسەرەکە لەقاند و وتی: بەڵێ خۆیەتی...!

سەرم کاس بوو، دڵم بەتوندی لێیدەدا، خەریک بوو بڕشێمەوە، ئازاری برینداریيەکەم لە بیر چووەوە، هەر سەیرم دەکرد بەو هیوایەی قسەکانی بگۆڕێ و پەشیمان بێتەوە. ئەفسەرەکە بەرەو ڕووم هات، سەری وەرچەرخاندم و بەتووڕەییيەوە وتی: "ئەی تۆ ئیشارەتی بۆ هاوڕێیەکەم کرد ئەوە دەناسی...؟".

بێ سێ و دوو وتم: "نەخێر... نەخێر نایناسم!!".

ئەفسەرەکە دایە قاقای پێکەنین و وتی: "سبەینێ... سبەینێ!!".

پاشان ڕووی کردە سەربازەکان و وتی: "بیبەنە حەوشەکەی پشتەوە... با ژوورەکان پیس نەکات!".

دەستیان دایەوە بن باڵم، کە خەریک بوو بڕۆین، ئەفسەرەکە وتی: «دەست و قاچ و چاویشی ببەستنەوە». زۆر بەقووڵی سەیری دەکردم، چاوەکانی بڕیبووە چاوم، پاشان وتی: «هەر جووڵاشەوە بیکوژن..!ل ١٧ و١٨) کاتێک خوێنەر بەر فەزایەکی هاوشێوەی وا دەکەوێت ئازارەکانی پاڵەوانەکە دەبێتە بەشێک لێی و خێرا لاپەڕەکان هەڵدەداتەوە، بۆیە لەوێدا دەقنووس و خوێنەر یەکتر دەبڕن، خوێنەر زیاتر بەرەو پلۆت و گرێ چنراوەکانی رۆمانەکە دەڕوات، دەقنووسیش قوڵتر دەچێتە نێو خەیاڵی وەرگر یاخود خوێنەر، ئا لێرەدایە خوێنەر بۆ پاڵەوانەکەی دەکەوێتە فرمێسک ڕشتن و پاڵەوانیش لە ڕێگەی کارێزمایی نووسەرەوە ڕقئەستوور دەبێت و ئیرادە و عینادی دەیگرێت بەرانبەر هەموو سزا و ئەشکەنجەکانی زیندان و هەرگیز تەسلیم بە ئیرادەی جەللادەکان و ویستی دەسەڵات و دادگایەک نابێت کە

دەیانەوێت نایاساییەک بکەنە یاسا و سزایەکی وەک لەسێدارەدانی بۆ دەردەکەن، ئەمە دەمانخاتەوە یادی ڕۆمانی (دادگایی) فرانتس کافکا، لەوێش هەمان شت هەست پێدەکرێ، لەگەڵ هەبوونی جیاوازییەکی جەوهەری چونکە " لە ڕاستیدا بۆ کەسایەتییەکانی کافکا، دوا چارەسەری قەیران مەرگە، واتە قەیران زۆرجار بە مەرگ کۆتایی دێت و مرۆڤی دەقەیران کەوتوو چارەیەکی نییە بۆ دەربازبوون جگە لەمەرگ، هەر بۆیەش بێ تەقەلا و هەوڵدانێکی ئەوتۆ زیندانیی خۆی ڕادەستی جەللاد و مەرگ دەکات، کافکا خۆی دەڵێ مەرگخوازی یەکەمین نیشانەی دەستپێکردنی مەعریفەیە" بەڵام پاڵەوانەکەی نێو ڕۆمانی بووژانەوەی ژیلەمۆ بە هیچ شێوەیەک نایەوێت بیر لە مەرگ بکاتەوە ئەگەرچی جۆر و شێوازی ئەشکەنجەکانیش لەلایەن جەللادەوە توندتر و دژوارتر بکرێن، بۆ ئەو هەر یەک شتە ئەویش خۆڕاگری لەپێناو مانەوە و پارستنی عەقیدەکەی، هەروەک نووسیویەتی: (من لەسەر دەم لێی پاڵکەوتبووم و لە بن دەرگاکەوە دەمڕوانییە ساڵۆنەکە کە قیژە و هاوارێکی زۆر بەهێز هاتە بەرگوێم، هاواری گریان بوو، دیار بوو کەسێک ئازار دەدرا، بەئاسانی گوێم لە پاڕانەوەی بوو، داوای بەزەیی لێ دەکردن بەڵام لەوە نەدەچوو ئازاردەران گوێبیستی داواکەی بووبن، چونکە هاتوهاوار هەر بەردەوام بوو.

خۆم دەهاتە پێش چاو، ئەو کاتەی بۆ ئازاردان دەبرێم، دەبێ چیم لێ بکەن، نینۆکەکانم دەربێنن، ئوتووی سوورکراو بەپشتمدا بهێنن، چاوەکانم هەڵکۆڵن. ئەمانەم بیستبوو کە لە ناوەڕاستی شەستەکاندا دەرهەق کۆمۆنیستەکان کرابوون و دەماودەم دەیانگێڕایەوە، من هەروا خۆم مات دابوو، سەیری ڕاڕەوەکەم دەکرد، گلۆپی کزی ڕاڕەوەکە و چۆڵی ساڵۆنەکە دیمەنێکی ترسناکی دەنواند، هاتوهاوار نەما، هێندەم زانی دوو سەربازم بەدی کرد کە دەستیان خستبووە بن باڵی

کابرایەکی کوردەوە و بەرەو ژووریکی تر دەیانبرد، دڵم داخورپا و تەزوویەکی سارد بەگیانمدا هات، موختار بوو...!!. موختاری هاوەڵمان کە یەکێک لە هاوکارانی کاری نهێنیم بوو، یا ئیلاهی چۆن گیرا...؟! تۆ بڵێی بزانێ منیش گیراوم) ل٧٤. هەروەها لە شوێنێکی دیکەی ڕۆمانەکە درێژە بە باسی شێوازی ئەشکەنجەدانی زیاتر دەکات؛ چۆن تەزووی کارەبایان لێداوە (دارەکەی دەستی ڕادەوەشان و هاواری سەربازەکانی بەردەرگای کرد وتی: "ئەم سەگەم بۆ بە کورسییەکەوە شەتەک دەن".

لە چاوترووکانێکدا فەرمانەکەیان بەجێهێنا و بەکورسییەکەوە بەستمیانەوە. ئەفسەرەکەش کە لێم هاتە پێشەوە و شەقێکی لە کورسییەکە دا، بەکورسییەکەوە، بەپشتا کەوتم. چەند جارێک دارەکەی بەئەسپایی دەکێشا بەبنی پێما و لە ناکاو بەهەموو هێزی دارێکی سرەواند بەژێر پێمدا. وەمزانی ژوورەکە ڕووخا بەسەرمدا. من لە داری سێهەم و چوارەمدا لە هۆش خۆم چووم.

نازانم چەند بێ ئاگا بووم، بەڵام بەڕشتنی دۆلکەیەک سەهۆڵاو بەسەروچاومدا بەئاگا هاتمەوە. هەموو گیانم زریکەی دەکرد. کورسییەکەیان وەک خۆی لێ کردەوە. هەستم بە ئازارێکی لە توانا بەدەر دەکرد. خەریک بوو بڕشێمەوە. سەرنجی ژوورەکەم دا، هەموو شتێک زەردباو دەهاتە پێش چاوم. ئەفسەرەکان دەمیان دەجووڵاند. گوێم لە هیچ نەبوو.

پیاوە ڕەنگ زەردەکە لە جێی خۆی هەستا. ئامێرێکی درێژکۆڵەی بەدەستەوە بوو، لە لایتی دەستیی دەچوو. لێم نزیک کەوتەوە. چەند شتێکی وت. هیچم نەدەبیست.

ئامێرەکەی نایە پەنا گوێمەوە. مێشکم خەریک بوو بتەقێ. هەموو گیانم هەڵدەلەرزی. شەپۆلی تەزووی کارەبا بوو. دەمارەکانی لەشم ژانیان دەکرد. چەند جارێک هێڵنجم دا. سەرم گێژی دەخوارد. هەموو

دەوروبەرم دەخولایەوە. سەرم بۆ ڕانەدەگیرا. ڕووناکی ژوورەکە تا دەهات کزتر دەبوو. هەموو شتێک لەبەر چاوم بچووک دەبۆوە تا بووە یەک نوقتە و ئیتر هیچ لەبەرچاوم نەما...ل٨٣) ئەرگیۆمێنتی کردەوە و هەڵسوکەوتی دار و دەستەکانی سەددامی خوێنمژ لە کتێبەکەی (عەبدوڵڵا کەریم مەحمود، ڕەشەبای ژەهرو ئەنفال) هاتووە کە چۆن لە هەشتاکاندا زیندان و شوێنە نهێنییەکانی ڕژێمی فاشیستی ئەوسای ئێراق فراوان کران، تەنانەت وای لێ هاتبوو لە هەموو قەزاو ناحییەکان و سەربازگە دوور لە ئاوەدانییەکان و شوێنە لاچەپەکان زیندانی تایبەتی بۆ زیندانیی سیاسی دروستکرا بۆ ئەشکەنجەدان و دەستدرێژی و ئیعدام کردن. سەدان گروپ و دەستەی جەللاد لە زیندانەکانیاندا پەروەردە دەکران لەسەر جۆرەکانی ئەشکەنجەدان و کوشتن و بڕین و تەنانەت لێکۆڵینەوەیان لە گەڵ منداڵی ٣-٥ ساڵ دەکرد، ڕووبەڕووی هەموو جۆرە ئەشکەنجە و دەستدرێژییەک دەکرانەوە. بۆیە مانەوە لە زیندانێکی ڕژێم بۆ تاکی کورد و بەتایبەت لەسەر بابەتی بیر و باوەڕی سیاسی و ڕەتکردنەوەی ڕژێمەکەیان هەموو ساتێکی بریتی دەبێت لە نیشاندانی مەرگ، بۆیە پاڵەوانی ئەم ڕۆمانە لە دڵی مەرگ ژیانی بە قەتماغە و خوێنی برینەکانی کڕیوەتەوە، وەک شۆڕشگێڕێک تەمسیلی ڕاستەقینەی شۆڕش و ویستی نەتەوەکەی کردووە لەکاتێکدا زیندانەکان ئەو دەزگا سەرکوتکەرە تۆقێنەرانە بوون، لێدان و ئەشکەنجەیان بە یەکێک لە بنچینەکانی مانەوەی دەسەڵاتی سیاسیی خۆیان دادەنا، بۆیە هەموو یاسایەکی شارستانی و مافە مەدەنییەکانی مرۆڤیان بەتەواوی تێدا پێشێل دەکرد.

ئەوانەی لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ زیندانییەکاندا دەکرد، بە جۆرێک گۆش کرابوون هەموو بەها کۆمەڵایەتییەکانیان بەلاوە نابوو، لە هەموو ویژدانێکی مرۆڤ سڕابوونەوە، بەلایانەوە ئاسایی بوو چاوی

زیندانییەک دەربهێنن، یا نینۆکەکانی دەربکێشن، ئەشکەنجەدانی منداڵێک یا پیرەمێردێکی پەککەوتەیان زۆر بەلاوە ئاسایی بوو. زۆر ئاسایی بوو لە زینداندا جەللادەکان دەست درێژی بکەنە سەر کچێک یا ئیعدامکردنی دەیان مرۆڤی خاوەن هەڵوێست، ئەم کردەوانە هیچ کارێکی لەسەر هەست و نەست و ویژدانی مردوویان نەدەکرد.

ئەو جەللادانە بە لایانەوە ئاساییە، دوای ئەو هەموو تاوانانەیان لە زیندان، کە لەدەرگای زیندان ئاودیوبوون، لە دەرەوە بە جۆرێک هەڵسوکەوت بکەن، وەک نە بایان دیبێت نە باران، بەڵێ ئەم جەللادانەی دوای ئەشکەنجەدانی زیندانییەکان دەگەڕێنەوە بۆ ناو خانەوادەکانیان لە ناو ماڵ و منداڵەکانیان بۆ ناو باوەشی خۆشەویستی هاوسەرەکانیان.

کوشتنی مرۆڤ لای ئەم جەللادانە مایەی شانازی و ئازایەتی بوو، بەدەست نەخۆشی گرێ دەرونییەکانەوە دەیانناڵاند. هەڵپەی پەلامار و داپلۆسین و توندوتیژییان لەناخدا دروست بوو، لەڕادە بەدەر دووچاری دەمارگیری و ڕەگەزپەرستی و لادانی وەک سادیەت هاتبوون. ئەمە جگە لە ئەزموونی زیندانی هەیئەخاسە لە کەرکووک، بەگوێرەی قسەی یەکێک لە زیندانییەکان (هەیئە خاسە نهێنیترین بەندینخانەی بەعسی تایبەت بە کوردەکان بووە، هەر بۆیە لەناو سەربازگەیەکی گەورەی وەک معەسکەر(خالید) لە دەرەوەی شاری کەرکووک بووە).

پاڵەوانی ڕۆمانی بووژانەوەی ژیلەمۆ دوای هێرشە سەختەکەی سوپای ئێراقی لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٨ بۆ سەر بارەگاکانی نێوزەنگ. لەگەڵ ئەبو زەففار و ڕێبەڕێک بە مەبەستی گەیشتن بۆ خاکی سووریا، بەقاچاخ سنووری رۆژهەلاتی کوردستان دەبڕن و گوندەکانی کانی زەرد و وەردە و بێوران بەسەردەکەنەوە. بەهۆی گرتنەبەری ڕێگای نهێنی، هاوشێوەی گەشتەکانی دیکە، سەختی زۆر دەچێژێت،

هەموو ئەو گەرما و تینوێتییەی لە زیندانی هەیئە خاسە بینی بووی خەریک بوو سەرما بیّ وێنەکەی ئەو ناوچەیە بیری بباتەوە.
وەک دەیگێڕێتەوە: (سەرمای بەرەبەیان وەک چزوو دەچزا بە دەموچاو و دەست و پەلمان) ٤٦٧، دوای ئەوەی لەسەر چیاکە بەرەو دیوی باکووری کوردستان دادەگەڕێن تا دەگەنە گوندی گەلیشم.
کاتێک لەوێش بەرەو شاری گەڤەڕ بەڕێ دەکەون بێگومان بەقاچاخی و دوور لەچاوی جەندرمەی تورکی، لەڕێگە ئاسوودە نابن .. دڵنیاشکرابوون جەندرمە خەڵکی مەدەنی ڕاناگرن، کەچی بەر لەوەی بگەنە شاری (گەڤەڕ) دەکەونە بۆسەیەکی تایبەتی، کۆمەڵێکی زۆری سەربازی کۆماندۆ بۆیان وەستابوون .. دەیانگرن و ئازاریان دەدەن و کۆتیان دەکەنە دەست. ئەوسا لە ترسی ئەوەی نەوەک بە ئێراقی بناسرێت و تەسلیم بەوێ بکرێتەوە، خۆی بە سووری دەناسێنێت، بەڵام لەبەر ئەوەی کۆنە پاساپۆرتێکی ئێراقی و کۆمەڵێک نامەی لێدەگیرێت کە لەناو ئوتومبێلەکە شاردبوویەوە، بەرەو سەربازگە گەورەکەی دەرەوەی ئەو شارەی دەبەن. لەوێدا لێپرسینەوەی جۆراوجۆری لەگەڵ دەکرێت، لەناویاندا سەرکۆنەی کوردبوون و شۆڕشەکەی دەکەن. گێڕەرەوە کە خودی خۆی کاراکتەری سەرەکی و پاڵەوانی ڕۆمانەکەیە بەپێچەوانەی زیندانی (هەیئە) لەناو زیندانی (گەڤەڕ) ئاماژە بەوە ناکات ئازاری جەستەیی درابێت. تەنیا ئەوە نەبێت کەلەپچەی لەدەست دەکرا و لەشۆڤاجیش دەبەستراوە. کاتێکش سەرنج دەدات شەوانە بۆ ماوەی چەندان کاتژمێر کارەبای سەربازگەکە دەکوژێتەوە، شەوێک بەلێزانی خۆی توانی کەلەپچەکەی دەستی بکاتەوە تاکو ڕابکات، بەڵام کە دەگاتە ڕاستی دەرگا دەبینیّ پاسەوانی لێیە و دەرەوەش یەکپارچە بەفرە، بۆیە ئەو کارەی بەدروست نەزانی.

ڕۆژێک بەرەو دادگەی مەدەنی شاری دەبەن. لەوێشدا دادوەر لەڕێگەی وەرگێڕ گوێی لێدەگرێت و بڕیاری پازدە(١٥) ڕۆژ زیندانی بۆ دەردەکات، ئەو ماوەیە لە زیندانی گەڤەڕ، زیندانییەکان و تەنانەت بەرپرسی زیندانییەکانیش ڕێزی دەگرن.

**ڕەهەندی خۆبەدەستەوەنەدان لە کۆڕۆمانی بووژانەوەی ژیلەمۆ:**

چەمکی خۆبەدەستەوەنەدان لە زانستی سۆسیۆلۆجی بە مانای خۆڕاگری و بەرەنگاربوونەوە دێت، ئەم زاراوەیە بە هەمان ماناش چۆتە نێو وازیی سیاسی، بۆیە دەبینین ئەو کەسەی لەڕووی فەرمانی دیکتاتۆریی دەوەستێتەوە پێکهاتە و ڕەهەندی سایکۆلۆجی بەرچاوی هەیە، بەشێوەیەک سیما و شکۆی کەسایەتییەکەی پتەو و پشت بەخۆ بەستووە، ئەمەش بەرهەمی ئەو متمانەیەیە لە بنچینەی بوون و درووستبوونییەوە سەرچاوەی گرتووە، واتە خاوەنی ئیرادەیەکە گوشارە زۆر و زەوەندەکانی "تۆقاندن" جا چ دەرەکیی بێت چ ناوەخۆیی؛ ناتوانن بیوەستێنن لە کردنە واقیعی هەرچی ویست و ئامانجیەتی، ئەمە تەنیا بۆ کەسێکی شۆڕشگێڕ نییە وەک کەسایەتی (دارا - سۆران ئەحمەد) پاڵەوانی ڕۆمانەکەی بەردەستمان، بەڵکو ئەمە بۆ هەموو کەسێکە لەهەر بوارێک بتوانێت خۆ بەدەستەوە نەدات و داوی ئیرادەی نەداتە دەست ناحەز، تەنانەت کەسانێک هەن بە بچووکترین جووڵە بەرانبەر خەم و مەینەتی دەوەستنەوە، بۆ نموونە ئەگەر ڕۆمانی زۆربا بخوێنینەوە کە زۆربا کەسایەتی ڕاستەقینەی ناوەوەی (نیکوس کازانتزاکیس١٨٨٣ - ١٩٥٧)ی نووسەرە و خۆی لە چەند دەستنووسێک ئاماژەی پێداوە: زۆر خولیای ئەو کەسایەتییەی ناوناخی بووە و ڕۆمانەکەشی بەناو کردووە، بە شێوەیەکی زۆر گەورە و بەرچاو پێیدا هەڵگوتووە، وەهای ناساندووە کەسێکە زۆر دڵی

بەژیانەوە خۆشە و غەمباری ناناسێت، تەنانەت لە کاتە زۆر زۆر سەختەکانیشدا سەما دەکات، جۆرە سەمایەک ئێستا بە (سەمای زۆربا) بەناوبانگە، لەم سەمایەدا وەک چۆلەکەیەک هەڵدەفڕێت و هەرچی هەیە لە دەوروپشتی لە مرۆڤ و باڵندە و بێگیانەکان لەبیر دەکات، هەروەها ئەگەر بگەڕێینەوە نێو کۆڕۆمانی بووژانەوەی ژیلەمۆ لە یەکێک لە مەشهەدەکان ئەو شێوازەی ڕووبەڕووبوونەوەی قەیرانی تێکەوتوو کارەکتەر عەبدوڵلایە و پێشنیازێک بۆ هەڤاڵەکانی دەکات، دەقنووس ئاوا وەسفی دەکات: (عەبدوڵلا، کە تا ئەو کاتە، گۆشەگیر بوو، ئەویش هەستایە سەرپێ و یەکسەر وتی: «بۆچی تۆزێک هەڵنەپەڕین!» پێشنیازێکی چاوەڕوان نەکراو بوو .. ئەگەرچی هەڵپەڕینی زیندانییەکانی ژووری لە سێدارەدانی بەندیخانەی مووسڵ، سەرانسەری وڵاتی گرتبووەوە و داگیرکەرانی خستبووە لەرزین بەڵام بۆ ئێمە کارێکی ئاسان نەبوو .. یەکێک لە پاسەوانەکانی ژووری خنکاندن لە مووسڵ وتبووی: «گەلێک ڕۆڵەکانی لەبەر پەتی سێدارەدا هەڵپەڕێ هەرگیز نامرێ)ل٨.

ئەمە سەرەڕای بەرزکردنەوەی ورە و ئیرادەی یەکتر شۆڕشێکی مەجازی و لە سەر و پۆتەلاکدانی جەللاد و نۆکەرانی ڕژێمیش بووە، لەهەمان کاتیشدا نووسەر پێمان دەڵێت: هەموو کارەکتەرێک، کەسێکی بیرکەرەوەیە و پەیامی هەیە، بەڵام گرفتەکە لە چۆنیەتی پێشکەشکردنەکانە، چونکە چۆنییەتی داخلبوونی قسەی هەر کارەکتەرێک لە ڕووی هونەرییەوە زۆر زەرووره بچووکترین بێئاگایی نووسەر کێماسیی و ناتەواوی دروست دەکات.

بۆیە کاتێک ڕەخنەگر بەشێوەیەکی پراکتیکی دەچێتە نێو کاژی کاراکتەرەکان، پاشخان و جیهانبینی دەقنووسی بۆ کەشف دەبێت.

ئێستا کارەکتەری سەرەکی ڕۆمانەکە لەو دۆخە ناهەموارەی تێیدایە، لە زیندانی (هەیئە)ی ڕژێمی ئێراقی لە ڕۆژانی ڕابردووی زیاتر کەوتۆتە مەترسی و نزیکبوونەوە لە "مەرگ"، ئەی نووسەر چۆن بتوانێت چارەسەری ئامانجەکەی بکات کە بریتییە لە هەلاتنی ئەم کارەکتەرە لەزیندان!؟ لێرەدا هەڵدەستێت بە گواستنەوەی زیاتری دیمەنە تراژیدییەکانی نێو زیندان و درێژکردنەوەی زەمەنی خوێندنەوە لای خوێنەر یان وەرگر، بەجۆرێک خوێنەر لە هزر و بیرکردنەوە سەرەتاکانی پاڵەوانەکە دوور دەخاتەوە، چونکە ناکرێت خوێنەر لە قارەمانەکەی تووشی نائومێدیی بێت و وزەی نەرێنی لا دروست بێت، بەهۆی سەرهەڵدانی بیرۆکەی "هەلاتن " و ئەگەری سەرنەکەوتن لە هەلاتنەکە، ئەمە لە زیندانی (گەڤەڕ)ی ڕژێمی دەوڵەتی تورکیاش دێتەوە بەردەم ئەم کارەکتەرە قارەمانە، ڕەهەندی خۆبەدەستەوە نەدان و تەسلیم نەبوون هەر بەرانبەر جەللادانی هەردوو دەوڵەتە ڕژێمییە دژ بە کوردەکە نییە، بەڵکو خۆبەدەستەوە نەدان بەرانبەر (تینوویێتیی و برسێتیی و ساردی و سەرما و هیلاکیی و هەڵگەڕان و داگەڕانی شاخ، دۆڵ و چیا) وەک لە بەشەکانی "سێگۆشەی سنوور و کاروانی چەک" خوێندمانەوە کە ئەم چەند پەڕەگرافە بچووکەم لێی بە نموونە وەرگرتووە و بریتین لە وێنەی مۆنۆدرامی و کاریگەر لەسەر هەستی خوێنەر .. نووسیویەتی: (هیچ پرسیاری ترم نەکرد. سەرەوژوور ملمان دەنا، ترپەی دڵم بە ئاسانی دەبیسترا. بن پێم ئازاری دەهات کە ئەو تەلاشە بەردە تیژانە لە بن پێم دەچەقین تەزووی ئازار بە هەموو گیانمدا دەهات، پێڵاوی لاستیک دادی نەدەدا ل١٧٦) یان کەباسی بناری چیای قەندیل دەکات و دەڵێت: (چ شەوێکی بێکۆتایی بوو، هەر ڕۆژ نەدەهات. هەموو لە سەرمان هەڵدەلەرزین و خەویش تینی بۆ هێنابووین، بەلام کەسمان نەماندەتوانی بنووین، زەوی ژێرمان تەڕ

بوو..) ل٢٣٧ هەروەها ورەبەرزی گەیاندوویەتییە ئەم قەناعەتە و دەڵێت: (لەکاتی مەترسیدا هیلاکی ڕۆڵ نابینێ و برسێتیش ڕێگر نابێ، بۆیە هەموو بەو هەستی ترسەوە، وزەی نوێ دەچووە جەستەمان) دواتر لە شەوێکی سارد بە دەلیلی و شارەزایی کەسێک کە ناوی (خەسرەو)ە ڕێگای پڕ هەڵکشان و داگەڕان دەبڕن. لە بڕینی زەویەکی بێ شوێنەوار و ڕێچکە و ڕێگا وندەکەن و دەڵێت: (من گومانم نەما کە ئەمە ڕۆیشتنێکی بێ ئاکامە، چونکە هیچ نەدەبینرا، سەر و خوار و ڕاست و چەپمان بۆ جیا نەدەکرایەوە) ل٢٥٤تا ٢٧٤، دواجاریش دەڵێت:( هەموو بێدەنگ بووین، سەرمای نێو دۆڵەکەش تا دەهات زیاتر دەرزیژەنی جەستەی دەکردین، بە ئاستێک کە هەموو هەڵدەلەرزین چونکە هیچ پەناو پاسارێکی گونجاوی لێ نەبوو خۆمانی لەپاڵدا حەشار دەین.. )ل٣٥٢ کۆڕۆمان، هەروەها لەشوێنێکی دیکە دەڵێت: (ئەو شەوە سەرما بە ئاستێک بوو کە مۆڵەتی ڕازانی بە کەس نەدەدا، هەموو هەڵدەلەرزین، بۆیە چۆقە چۆقی ددانمان لە هەموو لایەکەوە بە ئاسانی دەبیسترا، ئەوەش تەنیا دەنگێک بوو، جگە لە هاژەی ئاوی دۆڵەکە – کە تا دەهات بڵندتر دەبوو- هیچی دیکە هێمنی ئەو شەوە تاریک و نوتەکەی نەدەشڵەقاند... ,,ئەگەرچی هەموو برسی و شەکەت و بێ حاڵ بووین، بەڵام بە ورە بووین، چونکە چەک و پێداویستییەکانی جەنگمان بۆ ناوچەکانی خۆمان دەگواستەوە، کە ئەوەش وزە و گوڕوتینێکی بەهێزی بۆ بەردەوامبوون پێدەداین.. )ل٣٥٤، هەموو ئەمانە تەعریفی ڕاستەقینەی فەلسەفەی خۆڕاگریی و ڕووبەڕووبوونەوەن.

نووسەری ڕاستەقینەش خوێنەری خۆی خۆشدەوێت، بە وێناکردنی قەزییەکان و ڕێگە بە هیچ ئەڵتەرناتیڤێک نادا خوێنەر بەهەڵە بەرێت، بەڵکو خێرا ئەو پرسیارە لە ئەندێشەی وەرگر دەسڕێتەوە، بپرسێت ئایا پاڵەوان چۆن بیر لە "هەڵاتن "دەکاتەوە لە زیندانێک دە بەرانبەر ئەو

هێزەیە کە ئەم هەیەتی! لەگەڵ ئەوەش کۆڵنادات، تا دواجار ئەنجامی بیرکردنەوە ئاڵۆزەکانی پاڵەوانەکە دەخاتە بەردەم خوێنەر؛ ئیدی خوێنەر سات بەسات لەگەڵ گرێچن و"پلۆت" ی نوێ ڕێدەکات، لای ڕوون دەبێت پاڵەوانی سەرەکی هەموو ئەو ئەشکەنجە جەستەیی و دەروونییانەی بینیبووی کردوویەتییە هێزێکی پۆلایین بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی جەللادانی ڕژێم کە شەو و ڕۆژ خەڵکی گیراوی ناو زیندانەکە (کە زۆربەی کوردبوون) ئەشکەنجەیان دەدان، هەروەها دوای ئەوەی دڵنیا دەبێتەوە فەرمانی لە سێدارەدانی بۆ دەرچووە چونکە سەلمێنراوە ئەندامی ڕێکخراوی تۆڵەی (شەشی ئادار- ڕێتشا) بووە و لە نێو شاری سلێمانی دژی حکوومەتی بەعس چالاکییان ئەنجام داوە، ئازایەتییەکی قووڵ دەوری دەگرێت، بیرتیژتر هەوڵ و پلانەکانی کۆدەکاتەوە بۆ چۆنییەتی هەڵاتنەکەی، هاوکات بۆمان دەگێڕێتەوە چۆن لەنێو زیندان هاوەڵەکانی (موختار و عومەر و عەبدوڵڵا و سەروەر) دەبینێت، ئەوانە لەڕووی تەمەن جیاوازن، هەرزەکار و بەتەمەنیان تێدایە. چەندان ڕۆژ ئازار دەدرێن.

پرسی ئەوەشیان بەگوێدا دەدرێت لەسێدارە دەدرێن، بۆیە کاتێک بۆمان باسدەکات لە چ دۆخێکی پارادۆکسی دڵەڕاوکێ و ورەبەرزیدابوونە؛ خوێنەر درک بەوە دەکات ڕۆماننووس (سەلام عەبدوڵڵا) توانیوویەتی داهێنەرانە بیبات بۆ زانینی دۆخی زیندانی لە زیندانەکانی مەرگ و تاریکی ڕژێمێکی داماڵدراو لە هەموو بنەمایەکی ئەخلاقی. لەم پەڕەگرافە نووسەر نووسیویەتی: (لە دەنگی چەکوش و داکوتانی بزمارێک، بەئاگا هاتینەوە، هیچمان چاومان نەچووبووە خەو. سەروەر بەقۆڵی کراسەکەی، خوێنی لووتی دەسڕی. عەبدوڵڵا لە سووچێکدا ئەژنۆی گرتبووە باوەش، موختار لێوی دەبزواند، وابزانم ئایەتێکی دەخوێند. عومەر لەسەر شان لێی ڕاکشابوو، دەنگی داکوتان،

هەر بەردەوام بوو. بە ئاشکرا هەست دەکرا کە سەربازەکان خەریکی داکوتانی تەختە و دارن لە حەوشەکەدا. هەموو داکوتانی چەکوشێک، دڵی دادەخورپانین. تۆ بڵێی ئەمانە، بەم شەوە، لە قەنارەمان بدەن و ئەمەش ئامادەکردنی سەکۆی خنکاندن بێ. ئێستا لە نهێنی ئەو هەموو جلوبەرگانە دەگەم. دیارە ئەم شوێنە، شوێنی خنکاندنە. موختار هەستایە سەر چۆک و وتی: «کوڕینە وا بزانم سێدارەی خنکاندن دادەکوتن». عەبدوڵلا بەبێدەنگی لێوەکانی دەکرۆشت.

کەسمان قسەمان نەکرد، لە ڕاستیدا، نەماندەزانی، چی بڵێین. دیارە ئەمە دوایین شەوی ژیانمانە، عومەر دیار بوو، خەوی لێ کەوتبوو، چونکە دەنگی داکوتانەکە هیچ نەیدەبزواند، بۆیە موختار وتی: بەئەسپایی خەبەری بکەنەوە، نەکو سەربازەکان لە ناکاودا، خۆیان بکەن بەژووردا. با بەئاگا بێ و هەندێ قسەشی لەگەڵدا بکەین. کات زۆر کەمە، موختار هەر خۆی، چەند جارێک، عومەری ڕاوەشاند و بەئاگای هێنایەوە. دیار بوو لە خەوێکی قووڵدا بوو، چونکە بەهەستانی تەواو سەری سوڕما، وەکو بەچاوی خۆی بڕوا نەکات وتی: "خێرە هەموو وا بەخەبەرن".

سەروەر وتی: "گوێت لێ نییە، خەریکی داکوتانی سەکۆی سێدارەن"؟

عومەر بێدەنگ بوو هیچی نەوت. ل٧٩) ئیدی خەیاڵدانییان پڕ دەبێت لە وێنەی تەڵخی مەرگ، وادەزانن ئەو درداکوتانە ئامادەکارییە بۆ لە سێدارەدانیان .. نووسەر بە گواستنەوەی ئەم دیمەنە و تەواوی ڕۆمانەکەی ئەفراندنی باڵای ئەدەبی ئەنجام داوە، گەرموگوڕی و ڕاستگۆییەکی وای بە ڕۆمانەکە بەخشیوە سڵ لە هیچ دیمەنێک ناکاتەوە، تەنانەت ئەگەر لەخزمەتی کارەکتەری سەرەکییشدا نەبێت، لەکاتێکدا ئەو هەموو هەوڵی بۆ پێگەیاندنی پاڵەوانەکە خستۆتە گەڕ،

هەروەک ڕوبرت لویس ستیفنسون (١٨٥٠ - ١٨٩٤) نووسەر و ڕۆماننووسی سکۆتلاندی دەڵێت: (نووسەر کەسایەتییەک وەردەگرێ و ڕووداوەکان و هەڵوێستەکان هەڵدەبژێرێت، بە مەبەستی پێگەیاندنی ئەو کەسایەتییە).

کاتێکیش دەقنووس بە هاوڕێکانی دەڵێت: (هەڤاڵینە، دیارە ئەمانە بڕیاری یەکجارەکی خۆیان داوە، کە هەر لێرە لەناومان بەرن، بۆیە ئێمەش، ئەم سەرلەبەیانییە، دەبێ بۆیان بسەلمێنین، کە پەتی سێدارە، دڵی تێکۆشەران داناخورپێنێت." کەمێک وەستام و چاوم بەنێودا دەگێڕان، پاشان بەردەوام بووم: "ڕێی خەبات، هەمیشە بەگوڵ و گوڵزار نەڕازاوەتەوە. ئێمە هەردەم دەمانزانی، تووشی گرتن و زیندانی و کوشتن دەبین، ئێمە خۆمان ئەم ڕێگە پیرۆزەمان هەڵبژاردووە و هەرگیز لێشی پەشیمان نین"

سەروەر هەستایە سەر پێ و وتی: "گەلێک ڕۆڵەکانی نەبنە قۆچی قوربانی، چۆن بەئامانج دەگات".

دەنگی داکوتان، وەک دەهۆڵی جەنگ، دەهاتە بەرگوێ. عەبدوڵلا، کە سێ مانگ بوو ژنی هێنابوو، نیگەران و خەمبار دەهاتە پێش چاو، چوومە نزیکییەوە و وتم: "کاتێک دەمانبەنە بەر پەتی سێدارە، دەبێ تا دەتوانین و دەنگمان بڕ دەکات، هوتافی شۆڕشگێڕی بچڕێنین".

سەیرێکی سەروەرم کرد و وتم: "ئەوی شیعریشی لەبەرە، با شیعرێکی نیشتمانی بخوێنێ.."ل٨٠) ئەگەر سایکۆلۆژییەتی بەندییەکان و پاڵەوانەکە بخوێنینەوە چۆن لەو کاتە و لەنێو ئەم فەزایە پڕ لەتامی مردنە ، لە هەوڵی بەرزکردنەوەی کێڕڤی ئیرادەی یەکترن، کارەکتەری سەرەکی چۆن ئاوا بە شێوەیەکی کاریزمی وەک سەرکردەیەکی جەنگی هەستی هاوەڵەکانی هۆشیار دەکاتەوە، دێڕ بە دێڕی وشەکانی دەچنە

خزمەت ئەدەبی پیرۆزی زیندانی، ئەو ئەدەبەی لای هەموو گەلانی دنیا بە پیرۆز و قوتابخانەی هاندانی شۆڕش و بەرەنگاری تەماشا دەکرێت.

لێرەدا ڕووانینی بەندە بۆ ئەو کۆڕۆمانە ڕیالیزمە واقعییە کە ڕەنگدانەوەی خاسیەتەکانی شۆڕشگێڕیی و ئەو بارودۆخە ئاڵۆزەی میللەتی کورد تێیدا ژیاوە وێناکراوە، بە بەرهەمێکی پاک و ڕەسەنی کوردی ناودەبەم، چونکە نەچۆتە ژێر باڵی منەتی هیچ ئایدیاییێکی حزبی دیارکراو و کوردی وەک خۆی نووسیوەتەوە و لەگەڵ ئەوەش سنووری لۆکاڵیبوونی بەزاندووە؛ هەڵگری گوتارێکی نەتەوەییە و خۆی لە سیاقی "حزبی" نەهێشتۆتەوە، بەڵکو زۆر سەردەمییانە بارودۆخەکەی لە دەقێکی ناوازەی ئەدەبیدا بەرجەستە کردووە، بۆیە پێویستە لەپاڵ هەر کەموکوڕییەکیشی ڕەخنەگرانی بە سەلیقەی نێو ئەدەبی هاوچەرخی کوردی بابەتییانە کاری لەسەر بکەن، چونکە ئەم بەرهەمە هەنگاوێکی جیدی و جوانی بەجیهانی بوونی لەخۆگرتووە، هاوکات لە مێژووی فەرهەنگی ئەدەبیاتی کوردیدا هەر لە شیعرەوە بیگرە تا ڕۆمان و چیرۆک هەمووی بەریەککەوتنی هەیە لەگەڵ ئەدەبی زیندانی، بەڵام بێدەنگی ڕەخنەگرانی کورد و بێسەلیقەیی نووسەرانی کورد بەرپرسیارن لە لاوازی و کەمی بەرهەم و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی زیندانی تایبەت بە نەتەوەکەمان، دەنا هەر ئەو بەرهەمەی شاعیری گەورە قانع (١٨٩٨–١٩٦٥) دەیان لێکۆڵینەوە هەڵدەگرێت کە گوتوویەتی:

"گەرچی دوژمن وا ئەزانێ من بە دیلی لاڵ ئەبم
باش بزانێ کونجی زیندانم قوتابی خانەیە
گرتن و لێدان و کوشتن عامیلی ئازادییە
تۆپ و شەستیر و کەلەبچە لام وەکو ئەفسانەیە
بیری ئازادیم لە زیندنا فراوانتر ئەبێ
قوڕ بەسەر ئەو دوژمنەی هیوای بە بەندیخانەیە

گەر بە ئازادی نەژیم مردن خەڵاتە بۆ لەشم
نۆکەری و سەردانەواندن کاری نامەردانەیە"

دەتوانین بڵێین بابەتە سەرەکییەکانی ئەم کۆڕۆمانە، پرسی " زیندانەکانی دوژمن و هەوڵی هەڵاتن تێیدا و شۆڕشی پێشمەرگە و ڕیفۆرمی دیکتاتۆرییەتی ڕژێمی ئێراقە" کە نووسەر لەڕێگەی ئەم ڕۆمانەوە هەوڵیداوە قسەوباسێکی گەرم لەبارەیانەوە بکات، دیارە لەناو ئەدەبیاتی جیهانیشدا، وەک لە سەرەتاکانی ئەم بابەتە باسم کردووە زۆرجار نووسەرانی جیهان لەڕێگەی "ڕۆمان یان چیرۆک و یادەوەرییەوە" هەوڵیانداوە قسەی خۆیان لەم بارەیەوە بکەن بۆ نموونە: "ڕۆماننووس و فەیلەسوفی ڕووسیی (دۆستۆڤیسکی ١٨٢١_١٨٨١) لە ڕۆمانی شەیتانەکان، ئێمیل زۆلا ڕۆماننووس و شانۆنووس و نووسەری فەرەنسی (١٨٤٠-١٩٠٢) لە ڕۆمانی "ژێرمینال" دا گرنگی گەورەیان بە پرسی شۆڕش داوە و هەندێک جاریش ڕەخنەی توندیان لە دیدگای شۆڕشگێڕان گرتووە بەتایبەتی دۆستۆڤیسکی، لەگەڵ ئەوەش ڕۆمانەکەی مەکسیم گۆرکی زیاتر دەچێتە چوارچێوەی سیاسیی و هاندان بۆ شۆڕش.

لەناو کوردیشدا پێشتر ئەم هەوڵە هەبووە، بۆ نموونە ڕووناکبیر و نووسەر (ئیبراهیم ئەحمەد ١٩١٤-٢٠٠٠) لە ڕۆمانی "ژانی گەل" کە سەر بەئەدەبی زیندان و بەرگری و شۆڕشە، هەروەها ئەدیب و نووسەر (محەمەد موکری ١٩٤٥-٢٠١٢) لە هەردوو ڕۆمانی "سەگوەڕ و هەرەس" و شێرزاد حەسەنیش لە ڕۆمانی " ژنێک بەسەر منارەوە" هەوڵیانداوە بابەتی هاندانی شۆڕش کەم تا زۆر بورووژێنن.

**ڕەهەندی ئازادی و ماجەرای شکاندنی "زیندان بە زیندان" ی دوژمنان:**

بەهۆی بارودۆخی دژوار و لەمێژینەی پارچەپارچەبوونی خاکی کوردان و چاوتێبڕینی بەردەوامی دوژمنان، تاکی کورد هەر زوو بە مەسەلەکانی (ئازادی و ئازایەتی) گۆش بووە، بۆیە زۆربەی دەقە ئەدەبییەکانیشمان کە بەرهەمی ژینگەکەن، بوونەتەوە مەداری دروستبوونی سەدان و هەزاران قارەمانی وا کە چیرۆکی ئازایەتی و نەبەردییان بەرهەمهێناوە، ئەوجا لە داستانەکانی دڵدارییەوە بگرە تا بەرگری و نیشتیمانی، جەوهەری بابەتەکەش بەدەستهێنانی ئازادیی بووە، بێگومان ئەو کاراکتەرانەی بوونەتە خاوەنی ئەم جولە و ناسنامانە لەبنەڕەتدا کەسانی چاونەترس و دلێر بوونە، ئەمەش نەک تەنیا بۆ "پیاو" وەک چانسێک فەراهەم بووبێت بەڵکو هەردوو ڕەگەز تێیدا پشکدار بوونە، ئەوکاتەی (لەیلا قاسم ١٩٥٣_١٩٧٤)ی شۆڕشگێڕ براوەتە بەردەم پەتی سێدارە بۆ پەشیمانکردنەوەی لە هەڵوێستی کوردانەی، لەیلا لە وەڵامی پرسیارەکانی بەڕێوەبەری دەزگای هەواڵگری بەعسدا بێ باکانە ڕایگەیاندبوو: (بە کوشتنی من هەزاران کورد لە خەوی نەزانی هۆشیار دەبنەوە، زۆر خۆشحاڵ و سەربەرزم گیانم فیدای ڕێی ڕزگاری کوردستان دەکەم) هەواڵی لەسێدارەدانی لەیلا قاسم بە کوردستاندا بڵاو بووەوە، هەروەها هەندێک لە چاپەمەنییە جیهانییەکانی ئەوکات هەواڵی لە سێدارەدانی لەیلا قاسمیان وەک لەسێدارەدانی یەکەم ژن لە مێژووی سیاسی عێراق بڵاوکردەوە. ئەمە ئەوپەڕی ئازایەتی کچێکە تەمەنی تەنیا ٢١ ساڵ بووە.

بۆیە ڕەهەندی "ئازایەتی" لەم ڕۆمانە وەک ئیلهام و هێوێنی تەواوی ڕووداوەکان دەبینم، بەتایبەت کاتێک ئازایەتییەکەش دەچێتە بۆتەی تێکۆشان لەپێناو "ئازادیی"دا ڕێک بەر ڕوانگەی فەیلەسوفی بە ڕەگەز

ئەڵمانی (فریدریش نیچە ١٨٤٤– ١٩٠٠) دەکەوین، نیچە لای وایە (ئازادی توانایەکی شاراوە نییە، هەروەها ئەو ئازادیی بە سەرکەوتن لە بەدەستهێنانی ئامانجەکانمان و زاڵبوون بەسەر کێشە و تەنگوچەڵەمە و بەربەست لە پڕۆسەی بونیاتنانی خودێکی باشتر وەسف دەکات، ئەمەیان لەگەڵ برەودان بە پڕۆسەی گەشەپێدانی خود و سڵنەکردنەوە لە بەرەنگاربوونەوەی مەترسی و سەرکێشی لەم پێناوەدا کە لە خەسڵەت و هەڵوێستەکانی (سۆران)ی قارەمان یان کاراکتەرە سەرەکییەکەی کۆرۆمانی (بووژانەوەی ژیلەمۆ)دا تەریبن بەیەک، جاری وا هەیە مرۆڤ بەهۆی "ترس" و فۆبیای لە شتێکەوە ئازا و زاڵ دەبێت، بەسەر مەترسییەکی دیکەدا بۆیە جارجارە ئەگەر تێبینی سایکۆلۆژیەتی پاڵەوان بکەین، بەتایبەت لە بەندیخانەی (هەیئەخاسە) تێدەگەین بەهۆی ترسی زۆری لە کردە و ناوهێنانی "سزای سێدارە" حەز دەکات سەرکێشی بکات! بەڵکو هەر لەنێو زیندانەکە بەگوللەیەک شەهید بکرێت؛ نەک چوونە بەردەم پەتی سێدارە، وەک لە دیمەنی نۆرەهاتنی پاککردنەوەی "توالێت"ی زیندانەکە جەللادانی ڕژێم ئەم کارەشییان وەک بەشێک لە ئەشکەنجەی دەروونی لە دژیان بەکاربردووە، بەتایبەت کاتێک باسی یەکێک لە جەللادەکان دەکات، بەناوی (مونعیم )کە شێوە و پێکهاتەیەکی جەستەیی مەترسیداری هەبووە، بێگومان ئەمەش بۆ ڕاهێنان و وەرزشی تایبەت دەگەڕێتەوە، ویستوویانە لە هەموو درزێکەوە ببنە مەترسی بۆ سەر باری دەروونی بەندییەکان و تێکشکاندنی ئیرادەیان، ئەمە سرووشتی دەسەڵاتی دیکتاتۆر و هەموو ڕژێمە بێمۆڕاڵەکانی دنیایە، لەپاڵ ئەوە ئەگەر باس لە نموونەی ڕیزبەندی توندوتیژترین زیندانەکان لە جیهان بکەین بە زیندانی سەردەمی بەعسی ئێراقەوە، زیندانی (تەدمور)ی دەسەڵاتی حیزبی بەعسی سووریا پلەی یەکەمی هەیە لە نێوان بەندیخانانە توندوتیژەکانی

دنیا، جۆری سزاکانی جۆرێکن له هیچ زیندانێکی تردا بەو ئەندازە و شێوازە نین، هەروەها زیندانی (کارەدیرۆ) له بەڕازیل و (لاسەبەنیتا) له ڤەنزویلا، لەگەڵ زیندانی (دیاربەکر) له خوارووی تورکیا و زیندانی (لاسانتی) له پاریس، زیندانی (فلۆرانس) له کۆلۆرادۆ-ئەمریکا، زیندانی (کاتراز) له سانفرانسسکۆ له ئەمریکا، زیندانی (ڕایکرز ئایلەند) له نییویۆرکی ئەمریکا لەگەڵ زیندانی (ئاوشڤیتزی) که بۆ لەناوبردنی جولەکەکان بوو له پۆڵەندا، ئەمانە و هەزاران زیندانی دیکه که هەمیشە کەسانی نامۆ و ترسێنەر دەکەنە واجیهەی دەسەڵاتە سادییەکانیان. گومان لەوەدا نییە نووسەری (بوژانەوە) ویستوویەتی له ڕێگەی گێڕانەوە (السرد ـNarration ) گرنگیی بە خستنەڕووی ڕووداوەکان بدات و کار لەسەر پێشڤەچوونی (زەمەنی ڕووداو و گێڕانەوە و خوێندنەوە) بکات، ئەو دەزانێت لای (وەرگر) چیی ڕۆدەنێت و "دەق"ەکەی چۆن بە دیفاکتۆ دەکات له فەزای خوێنەردا، بەڕای من ڕۆماننووسی تەواو بەر لەوەی دەقنووس بێت دەروونناسە، نیگارکێشە، هونەرزانە. ئێستایش دەگەڕێینەوە بۆ تەواوکردنی پەرەگرافەکە، دەڵێت: (بەلاچاو سەیرێکی خێرایی مونعیمم کرد، ئەویش زەق زەق هەر سەیری منی دەکرد و پێدەکەنی و منیش له مەغزای ئەو خۆشحاڵییەی دەگەیشتم. سەرە گەیشتە سەر من، کەس نەمابوو، بەوردی سەیری تەوالێتەکەم دەکرد، زۆنگاوێک بوو بۆخۆی.. من بە تەنیا وەستا بووم، زیندانییەکان هەموو له حەوشەکەدا ڕاوەستا بوون و سەیری ئەو دیمەنەیان دەکرد. مونعیم لێم هاتە پێشەوە و قیژاندی بە سەرمدا: "بۆ وەک بت ڕاوەستاوی؟ فەرموو تەوالێتەکە پاک بکەرەوە. فەرمووو؟؟"

منیش بێ سێ و دوو یەکسەر وتم: "نایکەم"....

لەوە دەچوو ئەوە یەکەمین جاری بێ لەلایەن زیندانیانەوە گوێی لە وەڵامێکی وا بەرپەرچ بووبێت، وەک بە باشی گوێی لە وەڵامەکەم نەبووبێت وتی: "چیت وت؟"

سەرو پۆتەڵاکی خوێنی تێزا، چاوەکانی زەق بووبوون دەتووت هانا ها ئێستە دەردەپۆقن، لالغاوەی کەفی کرد، وەک بڕوا بەگوێکانی خۆی نەکات دووبارە وتی: "وتت چی؟"

من تازە بڕیاری خۆم دابوو، منێک لە سێدارە بدرێم هەر دەبوو وابڵێم. بێ دەنگیم وەڵام بوو، زیندانییەکان بە سەرسوڕمانەوە تێیان دەڕوانین، ڕەنگە ئەوانیش هەرگیز چاوەڕێی وەڵامێکی وایان نەکردبێت، بەڵام تازە من وتبووم، مونعیم وەک دەوترا، کاتی خۆی لە ساڵی (١٩٧٤) برایەکی کە سەرباز بووە، بەدەستی پێشمەرگە کوژراوە، بۆیە ڕادەی ڕقی ئەو بەرامبەر بە کورد سنووری نەبوو.

من چاوەڕوان بووم فیشەکێک بنێت بە سەر دڵمەوە، کە لە دڵەوە خوازیاری بووم، چونکە نەمدەویست بچمە بەر پەتی سێدارەو خۆم بە زەلیلی ببینم.

بێدەنگیەکی سامناک باڵی بەسەر دیمەنەکەدا کێشابوو، زیندانییەکان وەک باوەڕ بەوەی دەیبینن نەکەن، هەموو سەرنجیان لەسەر کاردانەوەی مونعیم بوو.

لەوکاتەدا (مارف) لەنێو زیندانییەکاندا هاتە دەرێ و سڵاوێکی سەربازانەی بۆ مونعیم کرد و وتی: "گەورەم، سۆران ناساغە و من لەباتی ئەو دەیکەم ".

لەوە دەچوو مونعیم بەو چارەسەرە قایل بووبێت، تفەنگەکەی کە لەسەر سنگم گیر کردبوو، لادا و بە هەڕەشەوە وتی: «دەتبینمەوە ...».

منیش بە دەنگی بەرز وتم: «لە سێدارە زیاتر نابێت ...ل٦٣) هەبوونی ئەو هاوسۆزییەی نێوان گیراوەکان کە "بیریی" ناسیۆنالیزمیی لە

زیندان کۆیکردبوونەوە ، کردبوونی بە کەس و پشتیوانی یەکتر، هەروەک لەم هەڵوێستەی "مارف" بەرانبەر سۆران خوێندمانەوە. ئەو پەیامە مرۆڤایەتییەی نێو ژانر و پێکهاتەکانی دیکەی "ئەدەب" یکی ڕاستەقینە و ڕەسەن پێشکەش بە کۆمەڵگە و نەوەکانی دەکات، هیچ ڕێگەیەک و تاکتیکێک ناتوانێت بیکات، ئێمە کە منداڵ بووین چاکترین ڕێگە بۆ دوورکەوتنەوە لە مەترسی و فێربوونی ژیان، بریتی بوو لەو چیرۆکانەی لە گەورەکانی خۆمانەوە دەمانبیست، بۆیە گوێگر یاخود خوێنەری جددی بەدرێژایی زەمەنی ڕابردوو تا ئەمڕۆش هەڵگر و تامەزرۆی ئەو سیحر و توانایەیە لەڕێگەی ئەزموون و ڕووداوی ئەوانی دی فێری دەبێت، زۆر گرنگە بەم شێوە ڕاستگۆییە شتەکان باسبکرێن، جا لەهەر قالبێکی ئەدەبیدا بێت، گرنگ ئەوەیە چۆن ئێستایەک لەنێو دنیای گڵۆباڵدا، بۆتە ساتەوەختێکی ترسناک، چونکە چەمکی گومان و کردەی پرسیارکردن دەستەوەستانە لە وەدەستهێنانی وەڵامێکی دروستی ڕاسیۆناڵ، لەکاتێکدا وەڵامە مارژیناڵەکان وەک پەراوێزێکی ناحەقیقی فریومان دەدەن و پڕاوپڕی هاوکێشەی گۆڕانکارییەکان نین، لەکاتێکدا جیلێک هەیە، لەگەڵ ئەوانەی بەڕێگەوەن، هەموو شتێک ڕەتدەکەنەوە، چونکە بەهۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا و سەرقاڵیی لاوەکانمان بە شتانی بێ سوود تا سنووری غەیبووبە ڕۆیشتووە، لەکاتێکدا ئەدەب لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا، یەکێکە لە کاریگەرترین لایەنەکانی نێو ڕۆشنبیریی جیهانی.

زۆربەی هەرە زۆریشیان بێ دیدگا و تەنانەت بێ خەونیشن، چونکە پاشخانێکی بەتاڵ و چۆڵیان هەیە لە مەعریفە و خەیاڵی هەمەجۆر، بۆیە هەبوونی ڕۆمانی وەکو "بووژانەوە" بووەتە پێویستی بۆ شوناس و ناسینی ڕابردوو؛ ڕابردووی ڕۆژگارێک شۆڕشگێڕانی ئەم نیشتمانە جگە لە چیاکان هیچ پشتیوانێکی دیکەیان نەبوو، بەڵام پێشمەرگەکان

خۆنەویست و لەخۆبووردوو بوون؛ هەر بۆیەش ناویان ناون پێشمەرگە، وەک د.ڕەحیمی قازی لە ڕۆمانی پێشمەرگە بەم شێوەیە باسی چیرۆکی ناونانی پێشمەرگەی نووسیوە و دەڵێت: کاتێک مامۆستا (هێمن موکریانی ١٩٢١_١٩٨٦) دێتە لای (قازی محەمەدی نەمر ١٩٠٠_١٩٤٧) پێی دەڵێت:

"قوربان وەڵڵاهی قسەیەکی هێندە خۆشم پێیە، ئەگەر بۆت بگێڕمەوە ڕەنگە باوەڕم پێ نەکەی، ئەوە دوو ڕۆژ بوو برادەرانی خوێندەوار و هونەرمەند و پسپۆر و زماننناسم وەکۆ کردبوو کە بزانین لە زمانی کوردیدا لەجیاتی وشەی سەرباز و نیزامی و عەسکەر و موجاهید و فیدایی، چ وشەیەک لە کار بێنین، زۆرمان قسەوباس لەسەر کرد، کێشە و هەرایەکی گەورە پەیدابوو، بەڵام نەتیجەمان وەگیر نەکەوت، هەموو ماندوو و شەکەت بووین و داوای چامان کرد، پیرەپیاوێکی دنیادیتوو چای بۆ هێناین و بە پێکەنینەوە گوتی: با نەخوێندەواریش بم، خۆ کافر نابم بڵێم کێشەی مامۆستاکان لەسەر چییە؟! لە وەڵامدا پێمان گوت بە پێچەوانەوە ڕەنگە بتوانی یارمەتیشمان بدەی. جا بڵێ بزانین لەباتی سەرباز لە کوردی چت پێ شک دێ؟ پیرە دیسان پێکەنی و گوتی: بێ بەڵا بن بۆ هێندە خۆتان ماندوو دەکەن، مەگەر نەتانبیستووە لە ڕابردوودا لەنێو کوردەواری بە پیاوی لەخۆبردوویان دەگوت "پێشمەرگە"ل١٠٩-١١٠ ڕۆمانی پێشمەرگە).

دوای بینینی هەموو ئەو دەردەسەرییانەی سۆرانی قارەمان لە زیندانی هەیئەی کەرکوک و بیرکردنەوە لە هەڵاتن و شکاندنی دەرگای زیندان، خوێنەر دەخاتە بەردەم ئالۆزییەکی وا لە دەروونشیکاری (دۆستۆڤیسکی)ش جێی نەبێتەوە! تۆ لەیەک زەمەنی خوێندنەوە بەر کۆمەڵێک ڕووداوی بەنێویەکداچووی دژوار دەکەویت، بەتایبەت بۆ ئەو لاوە کوردانەی دوای ڕووخانی رژێمی بەعس، هاتوونەتە ساحەکە ..

ئەو ڕژێمەی هەڵگری درووشمی شۆڤینیی بوو، لە ماوەی حوکمڕانیدا بە (ئاگر و ئاسن) لە هەوڵی سڕینەوە و پاکتاوکردنی ناسنامە و نەژادی نەتەوەکانی دیکەی ئێراق، بەتایبەت نەتەوەی کورد، بۆیە دوای ڕووخاندنی ئەم ڕژێمە دیکتاتۆرە یەک لەدوای یەکانەی لە ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ بەهۆی کودەتا حوکمی ئێراقیان گرتبووە دەست، تاکو مانگی ئاداری ٢٠٠٣ و کۆتایی پێهێنانی لەلایەن هاوپەیمانان.

هەر بۆیە ئازادی ئێراق و نەمانی زەبروزەنگی ڕژێمی بەعس نەک هەر هەوڵی هەڵاتن لە زیندان بەڵکو تەواوی ڕۆمانەکە لە یەکەمین لاپەڕە تا دوایەمینی، وەرگر یاخود خوێنەر دەخاتە بارودۆخی "شۆک" بوون، ئەم گێڕانەوەی مامۆستا "سەلام عەبدوڵڵا "وەک گێڕانەوەکانی (خۆرخێ لویس بۆرخێس ١٨٩٩_١٩٨٦) خەیاڵسازی تێدانییە، جارجار خوێنەر پشوویێک لەبەردەم خەیاڵێکی نوستالوژیی بێ ئازار و مەینەتیی نووسەر بدات؛ بەڵکو (بوژانەوەی ژیلەمۆ) پێکهاتووە لە گواستنەوە و پێشاندانی واقیعێکی تاڵ و تاریکیی نێو زەمەنی زیندان و ژیانی تاکێکی کورد کە نوێنەرایەتی بیری ناسیۆنالیزمی نیشتمانێک دەکات، بەوپەڕی ئازایەتیی ڕووبەڕووی ئاگر و ئاسن و ساردیی و گەرمیی ... هتدد بۆتەوە، هاوڕێ لەگەڵ بەندییە هاوبیرەکانی زیندانیان کردۆتە سەنگەرێکی دیکە و هاوار و هوتافی ئازادییان بەسەر قامچی ڕەشی بەعسدا زاڵبووە، نووسینی سەر دیواری زیندان (کەم ژیان و کەڵ ژیان) دوا وتەی ئەو شۆڕشگێڕە نەبەردانەیە لەژێر ئەشکەنجە گیانیان دەبەخشییە کوردستان، لێرە بەدواوە پاڵەوانی ڕۆمانەکەمان دوای پلانێکی دوور و تۆکمە، دەیەوێت یەکەمین هەنگاوی بوێرانەی لە زیندانەوە بەرەو بەدەستهێنانی شووناسی نەتەوە و ئازادی بنێت، سەرباری ئەوەی زەمەنێکی دوور و درێژە دەجەنگێت لەگەڵ جەللادانی زیندان، لە پێناو مانەوە و درێژەدان بە خەبات و ژیان. بەشێک لە

سەرچاوە ئەدەبییەکانی ئێمە پێیان وایە لە ئەدەبی کوردیدا نووسەر و شاعیر (شێخ نوری شێخ ساڵح ١٨٩٦_١٩٥٨) یەکەم کەسە بە شێوەیەکی جددی ڕەگەزی "ڕووداو"ی بە گرنگ زانیوە و لای وابووە ئەوە ڕووداوە وا دەکات کاریگەری دروست بێت لەسەر سایکۆلۆژیەتی (وەرگر/خوێنەر) کەواتە پەیوەندی نێوان (دەق و خوێنەر) لە چۆنییەتی هونەری گێڕانەوە یان نووسینەوە سەرچاوەی گرتووە. لەپاڵ ئەوەشدا ڕۆماننووس بە سەلیقە و پشوودرێژییەوە گرنگی تەواوی بە مەسەلەی (فرەدەنگی/پۆلیفۆنی) داوە، بەمەش لە کۆنتیکستی ڕۆمانی کلاسیکی دوورکەوتووەتەوە و بووژانەوەی ژیلەمۆی لە بۆتە و نۆرمی "تاکگەرایی" پاراستووە.

بۆیە کاتێک خوێنەر لەپاڵ ئەو هەموو ڕا، بۆچوون، پێشنیار، ڕەتکردنەوە، ترس، گومان، هەڵچوون، دژەیەک و ململانێیەی لە نێوان سۆران و ئەفسەر و سەرباز و جەللادەکانی زیندان کە ناو و شکل و شێوازیانی گواستۆتەوە و خوێنەر ناوەکانیان دەزانێت و نیشانیکردوون لەوانە (مفەوەز رەعد، جاسم، عەلوان و مونعیم و ...،تاد) لەلایەک و هەروەها سۆران و هاوڕێ زیندانییەکانی لە لایەکی دیکە کە بەشێک لە ناوەکانیان بریتیین لە (مامە سالە، غازی ئاوچی، مارف، مەغدید، عومەر، دەروێش مەولوود، حەمە تەها، خالید، موختار، شەریف و خدر ...،تاد) ڕوودەدات؛ ناتوانن گۆڕان بەسەر بیرکردنەوەی پاڵەوان دابێنن، خوێنەریش تا ئەوکاتەی بەدیار گێڕانەوەکەوەیە، (سۆران)ی لا بۆتە فیگەری ئەو قارەمانەی بتوانێت داستانی شکاندنی دەرگاو (ڕاکردن) و ئازادکردنی خۆی و هاوڕێکانی بەتایبەت ئەو هەژدە(١٨)کەسەی فەرمانی لەسێدارەدانییان هەبوو لەم زیندانە خوێناوییە، بکاتە ڕووداوێکی کۆنکرێتی و جارێکی دیکە خەبات و بەردەوامیدان بەرانبەر هێزی شۆڤینزمی سەددام..،مانفیست بکات، بۆیە لەم ساتە خوێنەر لە

هەموو کات هەستیارترە و چاوەڕێی ئەنجامە. ئیدی لەگەڵ خوێندنەوەی ئەم پەڕەگرافەی ڕۆمانەکە تێکەڵی بارودۆخەکە دەبینەوە، زۆر لە بیرۆکەکانی کاراکتەری سەرەکی پراکتیزە دەبن. مامۆستا سەلام بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ( نازانم چەند بوو نوستبووم، کە دەستێک لە کەلەکەمەوە وەژێندرا، کە چاوم هەڵبڕی، حەمە تەها بوو، سەری خستە پەنا گوێمەوە و زۆر بەئەسپایی پێی وتم: "هەستە خێرا".

وا بۆ چارەکێکە پاسەوانی حەوشەکە لەسەر تەنەکەیەک دانیشتووە و نابزوێ. هەستە؛ یەکسەر دەستوبرد منیش هەستام و لە بنی دەرگاکەوە ڕوانیمە دەرێ.

پاسەوانێک، لەسەر تەنەکەیەک، لە نزیک ژوورەکەمانەوە دانیشتبوو، کلاشینکۆفەکەی، لە تەنیشت خۆیەوە، بەدیوارەکەدا هەڵپەساردبوو. بۆ ماوەی چەند دەقیقەیەک سەرنجم دا. پاسەوانەکە هیچ نەدەبزوا و پرخەی دەهات. نابێ کات لە کیس بدرێ و ئەم هەلە هەر ئێستا نەقۆزرێتەوە. هەستام و کەوتمە خەبەرکردنەوەی هەڤاڵان. لە ماوەیەکی کورتدا، زۆربەی هەرە زۆریان، خەبەری بووەوە. هەموو هاتینە نزیک دەرگاکەوە، بەچرپە وتم: «ئێستا من دەرگاکە دەکەمەوە. پاسەوانەکە نوستووە، بزانم تفەنگەکەی لێ ناڕفێنین ...». هەموو بەسەر ڕەزامەندییان پیشان دا. ئەوانەی خۆمان هەموو بەخەبەر بوون و هاوڕێ مارف بەئەسپایی قسەی بۆ دەکردن.

غازی کە لای دەرگاکەوە ڕاکشابوو، بەخەبەر نەبوو. گرنگ ئەوە بوو لە کاتی کردنەوەی دەرگاکەدا بەخەبەر نەیەتەوە، بۆ ئەوەش دەبوو کە دەرگاکە کرایەوە، لەسەری نەدا.)ل٣٢ بووژانەوەی ژیلەمۆ، گواستنەوە و نمایشکردنی ئەم جۆرە وێنانە و پێشاندانی جوولەی خێرای کارەکتەرەکان دەمانخاتە بەردەم ئەو ئاگامەندیی و لێهاتووییەی مرۆڤ کە زۆرجار لە دواساتەکانی تەنگانەدا بەرهەم

دەهێنیت، سەرچاوەی ئەمەش قۆستنەوەی تەوقیتێکە بتوانێت کاریگەری لە ئاستێکدا جێ بهێڵێت؛ ئۆخژەنی دڵ و ئامانجگیر بێت.. وەک ئەو کارەی (حەمە تەها) کردی، ئاخر ئەم کاتێک بانگی (سۆران) دەکات و لەخەو بەئاگای دەهێنێت، ڕاستەوخۆ دەبێتە یەکەم بزوێنەری داینەمۆی ئازادی و هێزێک بەرپا دەکەن ئیدی هیچ شتێک ناتوانێت لەناوی ببات.

(هیگڵ ١٧٧٠_١٨٣١) دەڵێ "زانستی ئەم ڕێگەیە زانستی ئەزموونە، کە ئاگامەندی پیایدا دەڕوات؛ جەوهەر و جووڵانەکەی دەبن بە بابەتی ئاگامەندی. ئاگامەندی ئەوە دەناسێت کە دەکەوێتە نێو ئەزموونییەوە، چونکە هەر شتێکی لەنێو ئەزموونەکەیدا بێت، جەوهەرێکی هۆشەکیی و گیانەکییە. (حەمە تەها)یش خۆی پێشمەرگە بوو دەستگیر کرابوو، ئەویش ئەزموونی "تاڵ" ئایکۆنی ئاگامەندیی چالاکتر کردبوو، جوامێرێکی "دهۆک"ی بوو، دەستی "خیانەت" گەیاندبوویە ئەوێ، هەروەک بۆ سۆرانی قارەمانی باسکردبوو: («بە کارێکی نهێنی نێردرام بۆ نێو دهۆک. دەبوو پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی نێو شارەوە بکەم، بۆ ئەو مەبەستەش، شەوێک خۆم کرد بە (دهۆک)دا و چوومە ماڵی خزمێکم. ئەو شەوە لەوێ بووم. بەڵام هەستم کرد دەترسان، بەتایبەتی کە من بەچەکەوە چووبوومە ماڵیان، هەر بۆیەش کە ڕۆژ بووەوە پێشنیاری بۆ کردم بچمە دەرەوەی شار و لە باخێکدا خۆم حەشار بدەم، وتی؛ کەوا ئەو خۆی هەڤاڵانی ڕێکخستنم بۆ دەهێنی .. بەیانی زوو، بەئۆتۆمبێلەکەی، بردمییە قەراغ شار و لە باخێکدا دایناو و وتی کەوا دەچێ هەڤاڵانم بۆ دێنی. نەهاتەوە تا دەمەو عەسر، برسێتیش تینی بۆ هێنابووم بەڵام چیم بکردایە جگە لە چاوەڕوانی؛ دەمەو عەسر چوار زەلام و خزمەکەم هاتن. ئای چەند دڵخۆش بووم. کە نزیک کەوتنەوە لێم، خزمەکەم یەکسەر وتی؛ ئەوە خۆیەتی، ئیتر من فریای هیچ نەکەوتم. تفەنگەکەم، لەسەر زەوی، دانا بوو. هەر چواریان پەلاماریان

دام. زۆرم هەوڵ دا لە دەستیان قوتار بم. هەوڵێکی بێ ئەنجام بوو. هیچم بۆ نەکرا و تەنیا بەچاو سەیری خزمەکەم دەکرد. ئەوەی بۆ لەگەڵ کردم، کە پەلبەستیان کردم، دایانە قاقای پێکەنین و بەعەرەبی کەوتنە ئاخاوتن. پیاوانی ڕژێم بوون. بەرگی کوردییان پۆشیبوو. خزمەکەشم بەکرێگیراوی ئەمن بوو، هەر ئەوەندەم بۆ کرا تفێ بکەمە سەروچاوی. ئیدی بۆ ئەمنی نێو دهۆکیان ڕاپێچکردم. پاش هەفتەیەک ئازاردان بەرەو کەرکووکیان هێنام. ئێستاش وەک دەبینیت وا لێرەم ...»ل ٢٣بوژانەوە.

بۆیە حەمە تەها لە سۆران زیاتر پەرۆشە بۆ دەرچوون لەم میحنەتە.

لەو نێوەندەیش ڕوانینی "خوێنەر" بۆیان زۆر دژوارتر، وەک بڵێی چاوەڕوانی شتێکی زۆر مەحاڵ بن، ئەمەش دیوێکی ئەفسانەیە کاتێک دەبێتە واقیع، کەوتمە یادی ئەو وتەیەی داهێنەر و نووسەر و فیزیکزانی فەڕەنسی (بلیز پاسکاڵ ١٦٢٣_١٦٦٢) کاتێک دەڵێت: (دوو جۆر ڕوانین هەیە: یەکەم ئەوەیە هەموو شتێک وەک موعجیزە ببینین، ئەویتریش، هیچ شتێک وەک موعجیزە نەبینین ...) کەواتە زۆربەی شتەکان بە ویست و کۆششی خۆمانەوە بەندن، هیچ شتێ مەحاڵ نییە، نووسەر لە درێژەی گێڕانەوەکەیدا بەردەوامە و دەڵێت :(هەموو سەربازگەکە کشومات بوو، دەنگی هیچ نەدەهات، بەپەنجە بچکۆلەکەم، زمانی کێلونەکەم بۆ نێو سندووقەکەی برد. سەرکەوتوو بووم، بەڵام دەرگای ئاسن چ جیڕەیەکی کرد. وام زانی هەموو سەربازگە گوێی لێ دەبێ.

هەرچۆنێک بێت، هێواش هێواش، دەرگاکەم کردەوە، ئەوەندەی زەلامێکی پێوە بچێت، چونکە نەدەکرا زیاتر بیکەینەوە، گەر نا لەسەری غازی ئاوچی دەدا و بەخەبەر دەهاتەوە.

کاتێ دەرگاکەم کردەوە و ویستم بچمە دەرێ تفەنگەکە بهێنم، هەرچەندم دەکرد، بۆم مەیسەر نەدەبوو، بۆیە بە مەغدیدی بچکۆلەم وت، کە بچێتە دەرێ و تفەنگەکەم بۆ بهێنێ. کارێکی زۆر ترسناک بوو، جورئەتێکی لەڕادە بەدەری دەویست. هەموو ئانێک ترسی ئەوە هەبوو کە پاسەوانەکە بەخەبەر بێتەوە.

بەخەبەر بوونەوەشی، هەموو پلانەکانی هەڵدەوەشاندەوە. پەلی مەغدیدم گرت و ئەویش، لەسەر لا، چووە دەرێ و پڕی کرد بەتفەنگەکەدا، کە لە تەنیشت پاسەوانەکەوە هەڵپەسێردرابوو. ئای لەو ساتەی تفەنگەکەی دایە دەستم.

چ سەرکەوتنێک بوو.)ل ٣١ بووژانەوە، لەنێو ئەدەبیاتی کوردیدا لەدوای ئەوەی (چەک) بۆ بەرگریی بەکار بێت، مانا تۆقێنەر و پر ترسەکەی نامێنێت و مانای دیکەی وەک (دروشم، هێما و سیبمبولی) وەردەگرێت، هەروەها (شکاندنی دەرگای زیندان) و (هەڵاتن) بەهەمان شێوە بۆ مێژووی (ئەدەبی زیندانی) دەبنە ئامرازی سیمۆلۆژیا و ڕۆژانی ڕێنسانس، هاوکات خزمەتێکی گیانفیدایی ماناداریش پێشکەش بە پرۆسەی نیشتیمانی و شۆرشگێڕیی دەکەن، نەک هەر بەتەنیا ڕووداوێکی چەند کەسی و بەس... بەڵکو بۆ دوژمنیش پەیکێکی (دوالیزمی)یە .. تژی لووت شکان.!

ئەوجا لێرە (کات و جولەی خێرا) دەبنە تەریب، دەقنووس بە هۆشیارییەوە دابەشی سەر کارەکتەرەکانی دەکات، بە نموونە کاتێک خۆی بە کەلێنی دەرگاکەوە ناچێت خێرا و بێ کات کوشتن بەپەلە سوود لەو مێرمنداڵە دوانزە سیانزە ساڵییەی ناوی (مەغدید)ە وەردەگرێت؛ ئەمەش دەبێتە" هێما" و بێویژدانی ڕژێمی بەعس دەخاتە ڕوو لە دەست نەپاراستنیان بەرانبەر مێرمنداڵێکی ئاوا...، ئیدی تاکو بەم کەلێنە دەرگایە بچێت بۆ هێنانی چەکی پاسەوانە خەوتووەکە،

هاوکات بۆ ئەوەی غازی ئاوچی کە لە نزیک دەرگاکە خەوتبوو و گومانی "جاسووس"ی زیندانەکەی لێدەکرا بەخەبەر نەیەت. هەروەها ڕۆماننووس دەشڵێت: (ئیدی دەبوو دەستبەکار بین. تفەنگەکەم هێنایە ژووریٚ. زۆر بەئەسپایی هێنامە سەرپێ. دەنگی ڕاکێشانی میلی تفەنگەکە، هێندە بەهێز بوو، لەو شەوە هێمنەدا، وام دەزانی هەموو بەندییەکان بەخەبەر دێنێتەوە.

حەزم دەکرد زووربەی هەرە زۆری، بەندەکان بەخەبەر بهێنمەوە. بۆیەش بەدەست، چەند بەندییەکم خەبەر کردەوە. چاوی خۆیان هەڵدەگڵۆفی و بڕوایان بەو دیمەنە نەدەکرد. کاتێک دەروێش مەولوودم خەبەر کردەوە، چاوەکانی هەڵبڕی، نازانم چۆن دەیدیم چونکە وتی: «یا ئەڵلا... یا ئەڵلا».

یەکسەر لێی نووستەوە. (بە خێوم تێدەگەیشت؟) دەبوو کات بەفیڕۆ نەدەین، بۆیە هەرچۆنێک بوو، دەرگاکەم هێندە کردەوە کە بەئاسانی لەسەر لا مرۆڤی پێدا دەچوو. یەک لە دوای یەک، هاتینە دەریٚ، نازانم چەند کەس بووین، لە حەوشەکەدا پاڵمان دا بەدیوارەکەوە. سەرچاوەی پێشوو پاڵەوانی ڕاستەقینە و ئەوانەی تینووی ئازادین، هەمیشە ئارەزوومەندی ئەوەن زۆرترین کەس ڕزگار بکەن، بۆیە سۆران ویستوویەتی هەموو هاوڕیٚ زیندانییەکانی لەخەو بەئاگا بهێنێت.. کە دەشڵێت: (خالید هاتە بەردەمم و چرپاندی بەگوێمدا وتی: «بۆ نەچمە ژووری پاسەوانەکان، هەندیٚ تفەنگی تر بهێنم».

دەرگای ژووری پاسەوانەکان ئاواڵا بوو، بیرێکی چاک بوو، یەکسەر ڕەزامەندیم نیشان دا. خالید، لەسەر نووکی پیٚ، بەرەو ژووری پاسەوانەکان ملی دەنا. منیش، لوولەی تفەنگەکەم، بەرەوڕووی پاسەوانی سەر تەنەکەکە ڕاگرت.

که خالید هاته دەرێ، دوو تفەنگی تری بەدەستەوە بوو، هەر خێرا یەکێکم دا بەخۆی و ئەوی تریش بە حەمە تەها. ئیتر، هەر لەسەر نووکی پێ، ڕووەو دەرگای دەرەوە ڕێچکەمان بەست. وام پێشبینی دەکرد، که بەکردنەوەی دەرگاکە، ئیدی بەرەنگاری پاسەوانەکانی دەرەوە بین و ببێ بەتەقە. بە ئەسپایی سورگی سەر دەرگاکەم بۆ دواوە ڕاکێشا، ئەوەی دیم، جێی باوەڕم نەبوو. پاسەوانەکان، لە ژێر چادرەکەدا، لەسەر قەرەوێڵە، لێی ڕاکشابوون و دۆشکەکەش، کە پارێزگاری دەرگای دەرەوەی دەکرد، کەسی لەسەر نەبوو. هەلێک بوو، خوای گەورە بۆی ڕەخساندبووین، بۆیە یەک لە دوای یەک چووینە دەرێ. خۆشبەختانە، لە پشت چادرەکەوە، تەلبەندەکان هێنرابووە خوارەوە، بەڕادەیەک کە مرۆڤ دەیتوانی بەئاسانی بەسەریدا بڕوا، ئەوەش بۆیە وا داتەپێندرا بوو، بۆ ئەوەی بەندەکان کە دەچوون تەشتە خواردنەکانیان دەهێنا، بتوانن وەری بگرن.

ئیدی هاتینە نێو سەربازگەکەوە. هەر بەو ئاراستەیەی کە تەکسییەکەی لێوە بینرا بوو، ڕووەو ڕۆژهەڵاتی سەربازگەکە ملمان نا. ماوەی نێوان بەندیخانەکەمان و تەلبەندەکانی دەرەوە، هەر سەد مەترێک دەبوو، پێویست بوو بەزووترین کات بیگەینێ.

سەرم سووڕمابوو، دەتوت کەس لە نێو ئەو سەربازگەیەدا نییە، یان خوا چاوی کوێر کردبوون. بەڕۆژ ئەم سەربازگەیە جمەی دەهات، بۆ ئەمشەو وا کش و بێدەنگە. خوامان لە پشتە..)ل٣٣بووژانەوە، (جوبران خلیل جوبران ١٨٨٣- ١٩٣١) دەڵێت: (داهۆڵ بێزار نابێت لە ترساندنی مرۆڤەکان و چێژی لێ وەردەگرێت، ئەوانەش چێژی لێ وەردەگرن کە وەک داهۆڵ مێشکیان بە "کا" پڕ کرابێت) واتا داهۆڵەکان شتێک نین جگە لە گەیەنەری ترس، خۆیان ترسی حەقیقی نین. بۆیە سۆران و هاوڕێکانی قارەمانانە دوای هاتنە دەرەوەیان و سەیرکردنی ئەم

سەربازگە گەورەیە کە زیندانی ئەوانی تێدابوو، دەکەونە حاڵەتێکی سەیری دڵخۆشیی، سۆران سەرکردایەتی ئەو داستانە نەبەردییەی دەکرد، بە سەرسوڕمانەوە و بەشێوەی "مەنەلۆگ" لەبەرخۆیەوە دەڵێت: (سەرم سوڕمابوو، دەتوت کەس لە نێو ئەو سەربازگەیەدا نییە، یان خوا چاوی کوێر کردبوون. بەڕۆژ ئەم سەربازگەیە جمەی دەهات، بۆ ئەمشەو وا کش و بێدەنگە؟).

لەوێدایە زیاتر تێدەگات ئەمانە جگە لە "داهۆڵ" چیتر نین، سۆران و گروپە ئاکتیڤەکەی دەبنە "ئارگیۆمینت"ی ئەو ڕاستییەی .. بەڵێ نەتەوەی یەکگر و سەرڕاست دەتوانن لەباربەری دەسەڵاتی ستەمکار و دیکتاتۆر بن، پێچەوانەی ئەو نەتەوانەی دابەشی سەر دەیان دەستەن و بەمەش چەقبەستوو و "پاسیڤ" دەبن، ناتوانن بەدیهێنەری هیچ خەونێکیان بن.

ماجەرای هەڵاتن لە زیندانێکی وەکو زیندانی (هەیئە)ی کەرکووک یان معەسکەر خالید کە هەر لەنێو سەربازگە گەورەکەی کەرکوک بووە، ئاوا بە ئاسانی و بێ حیساب بۆ نەکردن لەلایەن ڕژێمەوە تێناپەڕێت، بۆیە هەرکە کاراکتەری سەرەکی ڕۆمانەکە (هاوکات ڕێکخەری هەڵاتنەکەیە) لەگەڵ هەریەک لە هاوڕێ زیدانییەکانی کە پێکهاتبوون لە: جەلال کوڕەداوی، مارف - مەلا حسین، لەتیف پۆلیس- سلێمانی، عومەر حاجی مامەندی، عەبدوڵڵا مەجید، سەروەر- دەروێش، حەمە تەها ـ بادینان، خالید هەولێری، فایەق دارەتوویی، بەکر تەڕەماریی، عەبدوڵڵا گەلاڵی، سەلام عەبدوڵڵا (سۆران) ئەمانە کە لە بەرواری (١٩٧٧/٩/٧) ڕادەکەن، ڕزگار دەبن بەڵام لە ئەنجامی ئەوەی حزبی بەعس زۆر جدییتر دەبێت لەسەر دۆزینەوەیان و دووبارە دەستگیرکردنەوەیان، سێ کەس لەو هەڵاتووانە کە (عەبدوڵڵا مەجید، فایەق دارەتوویی، بەکر تەڕەماریی) دەبن لە کەرکووک دەستگیر

دەکرێنەوە، بەڵام دواتر بەر لێبووردنی گشتی دەکەون و ئازاد دەبن، هەروەها عومەری خەیات کە یەکەم کەس بوو لە ڕێگەی برادەرە سیخووڕەکەیەوە گیرابوو و دوای ئەوەی لە ژێر تەعزیب و چەندین جۆر ئازاردان ناوی ئەندامانی گرووپەکەی کە گرووپی (ڕێتشا)بوو ئاشکرا دەکات، بەداخەوە لە ( ١٩٧٧/١٢/٣١) لە سێدارە دەدرێت. سەبارەت بە عومەری حاجی مامەندیش کە لە کاتی هەڵاتنەکە لەگەڵ سۆرانی دلێر بەیەکەوە دەبن و بە کۆمەڵێک نەهامەتی و ترس و دڵەڕاوکێوە دەگەنە (چەمچەماڵ) باسکردنی ئەم وردەکارییە مێژووییانە خزمەت بەو مسداقیەتە دەکات کە لەنێوان ( خوێنەر و نووسەر) دروست دەبێت، بەڵام ئەوەی جێی تێبینییە لای خوێنەر ئەو هەڵوێستەی سۆرانە، دوای ئەوەی عومەر لە کوخەکە جێ دەهێڵێت بۆچی کە گەیشتەوە سلێمانی هیچ هەوڵێکی بۆی نەدا!؟ تا ئەمیش بە سەلامەتی بگاتە جێگەی خۆی، لێرەدا سەرەتا وا دەزانیت ئەمە بێ وەفاییە یان گوێ پێنەدان، بەڵام کە دەچیتە قوڵایی باسەکە بەتایبەت بۆ خوێنەرێک رۆژێک زیندان و دەستبەسەری نەدیبێت قورسە بگاتە ئەو قەناعەتەی (کاتی ئازادی) چەند پڕ بەهایە، بۆیە ئەگەر بچینە سەر دەقی ڕۆمانەکە، دەقنووس دەڵێت : (بیرم بۆ ئەوە دەچوو کە ئیدی نابێ پێکەوە بین و تفەنگیش بەڕۆژ لە نزیک ئەم شارانە هەڵناگیرێ، بۆیە بە عومەرم وت: «وا بزانم ئیتر پێویستە جیا ببینەوە. ئیتر ناکرێ پێکەوە بین. من هەوڵی خۆم دەدەم، تۆش ئارەزووی خۆتە». دوای ماوەیەک گوتی: »ئەی من چی بکەم؟».ئەوە ئیتر ئارەزووی خۆی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا وتم: «من هەوڵێک دەدەم بگەمە سلەیمانی. تۆش گەر هەر لێرە دەبی. ئەوا خەڵکت بۆ دەنێرم کە یارمەتیت بدەن و ڕزگارت بکەن».پلانێکی دیاریکراو لە مێشکمدا نەبوو، نەمدەزانی چی ڕوو دەدات یان چیم بەسەر دێ، لەگەڵ ئەوەشدا بۆ دڵنیاکردنی وتم: «هەر بگەمە سلێمانی...». وشەکانم بۆ

تەواو نەکرا. باوەشی پێدا کردم و وتی: «خوات لەگەڵ».ل ٣٧ بوژانەوە) زۆربەی جار ئەو برە "کات"ەی دەکەوێتە بەر دەستی نووسەری رۆمان ئەوە بەسەر دەقەکە دەسەپێنێت کە ڕووداو هەرچەند گەورە بێت، ئەوا هەر وەک ڕەگەزێک لە رۆمانەکە تەماشا دەکرێت و مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت، بەجۆرێک دەبێت تەریب بڕوات لەگەڵ ڕەگەزەکانی دیکەی ناو ڕۆمانەکە؛ بۆیە کاتی ئازادی کارەکتەری سەرەکی نێو ڕۆمانی بوژانەوە زۆر کەمە، هەرکە بەر چۆڕێک ئازادی بکەوێت دەبینیین هەر فریای خۆکۆکردنەوە و جێگۆڕکێ دەکەوێت، لە تاو دەستگیرنەکردنی و بە ئامانج گەیاندنی پەیامەکەی، بۆیەشە ئەگەر شوێن لە کاری ئەدەبی گێڕانەوەدا ڕەهەندی ماددی و فەزای ژیان و جوولەی کارەکتەر پێکبهێنێت، ئەوە "کات " هەر خۆی خودی هەنگاوەکانیەتی، نووسەر و ڕۆماننووسی کۆچکردوو (مەهاباد قەرەداخی ١٩٦٦_٢٠٢٠) لە ڕۆمانی (ساڵێک لە دۆزەخ) کە باس لە ئەزموونی خۆی دەکات لە زیندانی بەعس، دەڵێت: ئەو کاتەی مرۆڤ لە زیندان ڕزگاری دەبێت، ژیان و دونیای زۆر لا شیرینتر و خۆشەویستتر دەبێت، دەیەوێت لەزەت لەهەموو دەققەیەک وەربگرێت، هەروەها دەشڵێت: من وا هەست دەکەم جارێک شەهیدبوومە! و گەڕاومەتەوە.. باسکردنی ئەم قسە جوانانەی خاتوو (مەهاباد قەرەداخی) بۆ ئەوەیە بڵێم : کارەکتەری سەرەکی و قارەمانی ڕۆمانەکەمان کاتێک گەورەترین سەرکێشی ئەنجام دەدات و پێ لەسەر گەرمترین بەردەکانی رۆژگار دادەنێت، لە پێناو ژیان و مانەوەی خۆی و هاوڕێکانی بووە، بۆیە دەکرێت "خۆشی" ڕزگاربوونەکەی کە وەک خەون وایە، بوو بێتە بابەتی لەبیرچوونی عومەر و جێمانی لەکوخەکە! هاوکات لەترسیی گیانی خۆی و ئاشکرا نەبوونی بووە، دەیویست بەزووترین کات شار جێ بهێڵێت، بەرەو چیا بڕوا، لەگەڵ ئەوەیش گەر

دووباره بگەڕێینەوە سەر دەقەکە ئەوا دەزانین کە سۆران بەردەوام بەشێوەی "مۆنۆلۆگ " خەمی پرسی عومەری هەر هەبووە، بێ ئەوەی دیالۆگی بابەتەکە لەگەڵ کەس بکات ، ئەمەش دەیگەڕێنمەوە بۆ نەبوونی متمانە و ئەو دۆخە دژوارەی لە شارەکە دەگوزەرا، هەروەک دەڵێت( سەرقاڵی خوێندنەوە بووم کە خانەخوێکەم لە دەرگاکەمی دا، ڕەنگی تێکچووبوو، دڵم داخورپا، نەزانرابێ کە من لێرەم، لە ڕاستیدا کارێکی ترسناک بوو، بۆ خۆی و خێزانەکەی، هەموو کەسێ ئەو بوێرییەی تێدا نەبوو. ویستم پرسیاری لێ بکەم کە خۆی وتی: «لە بازاڕ بووم و هەندێ هەواڵی ناخۆشم پێیە». من بێدەنگ بووم، دەمویست خۆی قسە بکات، لەم حەشارگەیەدا چی دەزانم. ئەگەرچی ڕۆژانە بەهۆی ڕادیۆوە گوێ لە هەواڵەکان دەگرم بەڵام هیچ دەربارەی ئەو ڕاکردنەی ئێمە نابیستم. وەک هەر هیچ ڕووی نەدابێ، بۆیە ڕۆژانە تامەزرۆی گەڕانەوەی هاوەڵەکەمم لە دەرەوە، بۆ ئەوەی دەنگوباس بزانم. هاوەڵەکەم وتی: (دەڵێن دوێنێ لای عەسر یەکێک لە ڕاکردووەکان گیراوەتەوە و تەسلیم بەئەمنی سلێمانی کراوە».دڵم داخورپا، کێ بێ؟ بۆ تەنیا یەک کەس، دەبێ هەر عومەر بێ، بەڵام چۆن گیراوەتەوە. ئەوەم لە هاوەڵەکەم پرسی. وتی: «لەگەڵ شۆفێرێکدا سوار بووە و ئەویش کە زانیویەتی لە زیندان هەڵاتووە یەکسەر لە بەردەم ئەمنی سلێمانیدا ئۆتۆمبێلەکەی ڕاگرتووە و خەبەری پاسەوانەکانی بەردەرگای داوە ...).

خۆفرۆش و خیانەتکار لە هەموو سەردەم و زەمانێکدا پەیدا دەبێ، بەڵام ئەمە چ ویژدانێکە هاووڵاتییەکی خۆت و هاوخوێنت بدەیتە دەست داگیرکەری وڵاتەکەتەوە. دەبێ هەر عومەر بێ و لەو شوێنەدا ئۆقرەی نەگرتبێ. منیش هیچم بۆ نەدەکرا وەکو پەیمانم پێ دا. ڕێکخستنە نهێنییەکانی شار نادۆزمەوە و بێ ئەوان چیم پێدەکرێ.)ل٤٠ بووژانەوە،

لێرەوە باری ناجێگیریی سایکۆلۆژیەتی سۆران وەک پاڵەوان ئەوەمان پێ رادەگەیەنێت ئەو لە خەمی هاوڕێکانی دابووە، هاوکات دوای ئازادیی و رزگاریشیان لەپاڵ هەموو مەترسییەکانیش هەریەکە و بەدوای ئامانجی خۆیدا ڕۆیشتووە، ئەم سەراحەت باسکردنە بە ڕاستگۆیی و بە ئازایەتییەوە دەمخاتەوە یادی نووسەری گەورە (چارلس بوکۆفسکی ۱۹۲۰-۱۹۹٤) کە چەند نووسەرێکی پڕ بەخشین بووە، ئەو لەناخەوە هۆنراوە و پەخشانی هەڵدەهێنجا بۆ وێناکردنی پووچییەکانی ژیان کە زۆرێک بەهۆیەوە گەیشتوونەتە جێگایەکی بەرز لەسەر حیسابی ژیانی چەوساوەکانی کۆمەڵگەی ئەمریکی، هەروەها قارەمانەکانی نووسەر پشتیان بە ئەزموون و سۆزو خەیاڵ دەبەست لە کارەکانیدا، زمانێکی ڕاستەوخۆ و توند و وێنەی زایەندی بەکار دەبرد. هەندێک لە ڕەخنەگران وایان دەبینی شێوازی بوکۆفسکی وشک و توندوتیژە، لە بەرانبەریشدا ئەوانی دی وایان لێکدەدایەوە هەڵوێستەکانی جوامێریین، هەربەهۆی ئەم ڕاستگۆییەی لە نووسین، لەزۆربەی نووسەرەکان جیادەکرایەوە لە لایەن خوێنەرەکانییەوە، دەیانزانی بەسەرهاتەکان ، یان نۆڤڵ و هۆنراوەکانی، زادەی ژیانی خۆیەتی و پێشکەشییان دەکات، بۆیە ئەو کاتەی لە نووسەری بوژانەوەم پرسیارکرد لەبارەی کەمی خەیاڵ و بەکارنەهێنانی تەکنیکی زۆر فەرمووی: ویستم ئەو شتانە بنووسم کە بینیومن و هەروەها خوێنەریش باوەڕی پێی هەبێت. هاوکات گەورەترین تەکنیک بەلای منەوە کە ڕۆماننووس ئەنجامی دابێت لەم ڕۆمانە بریتییە لە: (نووسین و گێڕانەوەکەی) چونکە خودی گێڕانەوە تەکنیک و شارەزاییە. لەگەڵ ئەوەش بیرمان نەچێت نووسەر وەک پێشمەرگەیەک ئەم ڕۆمانەی نووسیوەتەوە، نەک کەسێک کە ساڵەهابێت خەریکی نووسین و ڕۆمان و چیرۆک بووبێت، هەروەها ئەوەی جێی باسە "گوتارە " لە ڕۆمانەکە،

بریتییه له دەربڕینی پەیامێکی گرینگ کە هێشتا نەگەیشتۆتە ئامانجی حەقیقی، هاوکات وەک شێوازێکی دیاریکراوی ئاخاوتن، کە بریتییە لە نەریتێکی نۆرم بەندیی کە زنجیرەیەک یان ڕیزێک دەربڕین و فۆنەتیک پێکەوە گرێدراو بەدی دەهێنێت سەبارەت بە بابەتێک، وەک دەروونناسی ، مێژوو ، دەسەلاَت و ئەدەب و ...تاد.بۆیە سەرەڕای هەبوونی هەر تێبینییەک من ئەم ڕۆمانە بە کارێکی ناوازەو پێویست دەبینم بۆ پێشڤەچوونی ئەدەبی "زیندان" لە نێو دنیای نووسینی کوردییدا،

زۆریی ڕووداوەکانی نێو "ڕۆمانی بوژانەوەی ژیلەمۆ" هەقیقەتێک بەرجەستە دەکات ئەویش شێوازی بنیادی گێڕانەوەکەیە لە نێو ڕۆمانەکە، لەگەڵ ئەوەی گێڕەرەوە خودی پاڵەوانەکەیە و هەموو شتەکان دەزانێت، بەلاَم کەمترین جار هەوڵیداوە سوود لە مەسەلەی "یادکردنەوە" وەربگرێت، بەڵکوو هەموو ڕووداوەکان بەشێوەی زنجیرەیی بەدوای یەکتردا ڕوودەدەن، هەر ئەمەش بۆتە ڕەگەزێکی بزوێنەر و لابەری تەمی ڕەگەزەکانی دیکە، بە شێوەی پراکتیزەیی لەگەڵ یەکتریدان و جیانابنەوە، هەرچەندە پێش کۆکردنەوەی ڕۆمانەکە لەیەک بەرگ بەناوی (بوژانەوەی ژیلەمۆ) پێشتر لە چەند کتێبی جیا جیا نووسیبوونی، بەناوەکانی (هەیئە، سێگۆشەی سنوور، زیندانی گەڤەڕ، کاروانی چەک) لەهەموو بەشەکانی بەباشی دۆخی کەسێتییەکان نیشاندەدات. ئەم جۆرە رۆمانانەیش توێژەرە فورمالیستە ڕووسەکان گرینگی تەواویان پێداوە.

دوای ئەوەی سۆران بە چەندین دەردەسەری گەیشتە لای هەڤاڵەکانی لە چیا و قۆناغی پێشمەرگایەتیی دەستپێدەکات، لەوێوەش کۆمەڵێک ڕووداوی سەیر دێنە پێش، ئەزیەت و ئازارەکانی نێو ئەم چیاوچۆڵە و سەرما و هەڵلەرزین و برسێتی و ..تاد؛ هیچی کەمتر نابی

لەو ئازارانەی لە زیندانی هەیئە بینیبووی، موعاناتی بەرباران، سەرما و کرێوە ڕۆمانی (ئەو هەورە کپە)ی وەرگێڕ و ڕۆماننووسی کورد (بەیان سەلمان) دێنێتەوە یاد، تیایدا باس لە بیرەوەری (کۆڕەو) لەدەست ڕژێمی دیکتاتۆری ئێراق دەکات.

هەر دوای هێرشە سەختەکەی سوپای ئێراقی لە کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٨ بۆ سەر بارەگاکانی (نێوزەنگ) دوای شەڕێکی سەخت، سۆران بە نامەیەکی تایبەتی فەرماندە (ئەنوەری مەجید سوڵتان) هاوڕێ لەگەڵ (ئەبو زەففار )ی کۆمەنیستی ئێراقی دەبێت و دەلیلێکیش بە قاچاغ بەرەو سوریا دەکەونە ڕێ، بە مەبەستی گەیاندنی چەند نامەیەک و چارەسەرکردنی ئاوساوی ڕوخساری، لە شەوی دەسگیرکردنەکەی لەلایەن ئیستخباراتی سلێمانی کەوتبووە بەر پەلاماری بێ ویژدانانەی جەللادانی ڕژێم، ئیدی سنووری ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە -ئێران- دەبڕن و دەچنە نێو سنووری باکووری کوردستان لە - تورکیا- لەوێ تووشی دووبارە گیران و زیندان دەبێتەوە، ئەگەر بەراوردی ئەم دەستگیرکردنە و زیندانی "گەڤەڕ" بکەین ، هەڵبەتە گەڤەڕ یەکێکە لە شارەکانی (باکووری کوردستان) لە تورکیا و سەربە پارێزگای هەکارییە، ئەوا ئەم دەستگیرکردنەی هەر لە کەشوهەواکەی تا دووبارە "هەڵاتن"ەکەی زۆر جیاوازە لەگەڵ زیندانی "هەیئە"ی کەرکووکی باشووری کوردستان لە ئێراق، کە بەم شێوەیە ڕۆماننووس وەسفی کردووە: ( دوو سەرباز دەستیان دایە بن هەنگڵم و بەرزیان کردمەوە و بردمیانە بەردەم ئەفسەرەکەیان، ئەویش چەند پرسیارێکی لێکردم کە دیارە منیش هیچی لێ تێنەدەگەیشتم، بۆیە بە هەموو توانای زللەیەکی تێسرەواندم.

بەلەقە کەوتنە سەر پشتی (م) پاشان، وەک من، دەستیان دایە ژێر شانی، ئەویشیان هێنایە بەردەم ئەفسەرەکە، چاوێکی خێرام بە

دەوروپشتی خۆمدا خشاند، دەیان سەربازی خوودە بەسەر بە دەورمانەوە بوون.

ڕەنگ و ڕوو و جلوبەرگ و چەکەکانیان هەمووی نیشانەی ئەوە بوون کە ئەمانە سەربازی تایبەتین و پۆلیسی قاچاغ نین.

ئەفسەرەکە، جارێکی تر، زۆر بە توندی، بەسەرمدا هەڵشاخی و منیش بۆ ئەوەی وای پیشان بدەم کە منیش خەڵکی ئەو ناوچە سنوورییانەم وتم: «ئەز تورکی نازانم!».

ئەفسەرەکە دایە قاقای پێکەنین و دەقاودەق لاسایی کردمەوەو وتی: «ئەز تورک نەزان!!».

ئەمەی وت و هەتا توانیی زللەکی تری کێشا بە پەناگوێمداو هەندێ قسەی تری لەگەڵدا کردم کە دیارە هیچ حاڵی نەبووم، بۆیە شانی (م)ی ڕاکێشاو هێنایە بەردەمم و جارێکی تر کەوتەوە هاوار بەسەرما (م) وتی: «ئەڵێ خەڵکی کوێی؟».

یەکسەر بێ بیرکردنەوە وتم: «سووریا!».

ئەفسەرەکە چاوی زەق بوو، وتی: «سووریا؟؟»

پاشان تا توانی بۆکسێکی لێدام و فەرمانی بە سەربازەکانی دا، لە چاوتروکانێکدا من و (م)یان فڕێدایە پشتی لۆرییەکی سەربازییەوەو چەند سەربازێک لەگەڵماندا سوار بوون). ل ٥٧٠ بووژانەوەی ژیلەمۆ، یان لەکاتی لێکۆڵینەوەکەیدا هەر پەیوەندار بەم باسە نووسەر دەڵێت: (لە ژوورەکەدا هەر ئەو ئەفسەرەی کە لە گرتنەکەمدا بەشداریی کردبوو دانیشتبوو، عەریفێ، بەپێوە، لای ڕاستی مێزەکەیەوە ڕاوەستابوو، ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام گڵۆپی ژووری ئەفسەرەکە بوو کە جاروبار دەکوژایەوەو پاشان هەڵدەبووەوە لە ڕاستیدا، ئەوکاتە، لەو نهێنییە نەدەگەیشتم، دیمەنێکی سەیرو تەواو ترسناکیشی بەو دەوروبەرە دەدا.

وێنەیەکی گەورەی مستەفا کەمال، کە لە پشت سەری ئەفسەرەکەوە، هەڵواسرابوو، لە کوژانەوەو هەڵگیرسانەوەی گڵۆپەکەدا، وەک تەنیا بە گومانەوە سەیری من بکات، دەبینرا.

ئەفسەرەکە کەوتە قسە، زۆری ڕست، کە هیچی لێ تێنەدەگەیشتم، لام سەیر بوو، بۆ لای ئەمانە هەرچی مرۆڤی سەر ڕووی ئەم زەمینەیە، دەبێ تورکی بزانێ، لە قسەکانی هەر سەرم بادەدا کە لەناکاودا یەک مستەکۆڵەی دا بەسەر مێزەکەیدا، بۆیە منیش بە ناچاری، بە ئینگلیزی پێم وت: «من تورکی نازانم گەر ئینگلیزی دەزانن، فەرموون، با قسە بکەین».

قسەکانم، ئەوەندەی تر، هاری کرد، هەستایە سەرپێ و بە توندی یەخەی گرتم و چەند جارێک ڕایوەشاندم و هەر بە تورکی دەیقیژاند، لە ڕاستیدا سەرم لە بێ ئەقڵیی ئەفسەرەکە سووڕ دەما، بۆیە ئەمجارەیان پێم وت: «یان، کەسێک بهێنن، کوردی بزانێت».

بە بیستنی وشەی کورد، ئەفسەرەکە، ئەوەندەی تر، تووڕە بوو، دیارە لای ئەمان، کە بەڕەسمی کورد وجوودی نەبێ، ئیدی، چۆن دەبێ زمانێک هەبێت کە کوردی بێت) ل ٥٩١

دەتوانم بڵێم : هەموو (ڕەخنەگرانی نوێخواز) ی نێو ئەدەبیات لە جیهان، کۆک و یەک هەڵوێستن لەسەر ئەوەی کە پەیوەندییەکی توندوتۆڵ و ڕاستەقینە لەنێوان (ڕەخنەی ئەدەبی و زانستە مرۆڤییەکان)ی دیکەدا هەیە؛ بەجۆرێک ئەنجامەکانی ئەو زانستانە بۆ لێکۆڵینەوە و دەقە ئەدەبییەکان بە کەڵکن. ڕەخنەی نوێی ئەدەبی بە گوێرەی ئەو چەمک و ئەزموونانەی لە زانستەکانی دیکەیان دەستخستوون و پرکتیزەیان کردوون بەو شێوەیە ڕێکخراون: (ڕەخنەی دەروونناسانە، ڕەخنەی کۆمەڵناسانە، لەگەڵ ڕەخنەی پێکهاتەخوازانە لە زانستی زمانناسیدا). لێرەدا ئەگەر سەیری جەللادان

و هەڵوێستی ئەم وڵاتانە بکەین کە کوردستانی گەورەیان بەسەردا بەشکراوە، لەڕووی ڕەخنەی دەروونشیکارییەوە لێیان بڕوانین ئەوا ئەم زانستیی شیکارییە چاوی لەسەر ڕوانینەکانی ناخی مرۆڤ و لێکدانەوەی دەروون و خوێندنەوەی ڕەفتار و گوفتارەکانی مرۆڤە، وەک هەوڵێک بۆ دۆزینەوە و تێگەشتن و چارەسەرکردنی ئەو گرێ دەروونیانەی مرۆڤ بەدەستییەوە دەناڵێنێت و ڕێگرن لە بەردەمیدا بۆ بەرەوپێش چوون و گەشەکردن، بەستنەوەی ئەم بابەتە بە مەسەلەی "کوردبوون" و ڕەتکردنەوەی لە لایەن وڵاتانی داگیرکەرەوە ڕێک هەمان"گرێ دەروونیی"یە بە لاسایی کردنەوە و گاڵتەجاڕیی وەک ئەو ئەفسەرە تورکەی لاسایی سۆران دەکاتەوە و دەڵێت «ئەز تورک نەزان!!» بێ ئەوەی هەست بەوە بکەن لایان بۆتە نەخۆشیی و نایانەوێت دان بە هەبوونی "کورد"ەوە بنێن، ئەوە هەمان هەڵوێستیشە کە ئەفسەران و سەربازانی ڕژێمی ئێراقی کردبووە جەللاد بەسەر تاکی بێ تاوانی کوردەوە، هەر لە هەمان دەمی گواستنەوەی وێنەی دەستگیرکردنییەوە سەلام عەبدوڵڵا دەڵێت : (زۆر بە زەحمەت، لە پشتی لۆرییەکەدا، خۆم بۆ ڕادەگیرا، چونکە دەستم کەلەبچە کرابوو ناچاربووم قاچم بە توندی لە بنی لۆرییەکە گیر بکەم، بەلاچاو سەیری (م)م کرد، ئەویش نوقمی بیرکردنەوە بوو، بە ئەسپایی پێم وت: «ئەو بەڵایە چی بوو؟».

یەکێک لە سەربازەکان گوێی لە دەنگم بوو، بۆیە بە هەموو هێزی قۆناغە تفەنگێکی لە سینگم داو لەسەر کورسییەکە خستمیە خوارێ، یەک دوو سەربازی تر برێ قسەیان کرد و هەڵیان ساندمەوە و لە جێگەی پێشووم دایاننامەوە، پشتی ئۆتۆمبێلەکە بێ ئەندازە ساردبوو، کورسییە ئاسنینەکانی ژێریشمان هەر پارچەیەک سەهۆڵ بوون). هەمان لاپەڕەی پیشوو، پاڵەوانی ڕۆمانی بووژانەوە فیگەری قارەمانی

وەرزەکانیشە، ئەوکاتەی لە هەیئە بوو بەر گەرماییکی زۆرکەوت کە بەشێک بوو لە سزا و ئەشکەنجە دەرونییەکانی، هەرچەندە ئەو تینی گەرمایە ئازاری جەستەی داوە بەڵام ئامانجە سەرەکییەکە ئەشکەنجەی دەروونی بووە، لێرە لە (گەڤەڕ)یش (بەفر و سەرما ) دەوری تەنیووە، خراپی مامەڵەی سەربازەکانیش ئیدی لە وڵاتێکی وا هەر هێندەی لێ چاوەڕێ دەکرێت.

بەکارهێنانی پیت لە بری ناو ، باوە و پێشتریش هەر هەبووە، بۆیە هەندێک جار نووسەر پەنا دەباتە بەر بەکارهێنانی (پیت/حەرف) لەبری ناوی کەسەکە یان ئەو کارەکتەرەی بەشدارە، بەبڕوای من پەیوەندی بە واقیعییەتی ڕۆمانەکە و ئاستی ئەو پەیوەندییەش کە زەمەنی نووسینەوەکەی جیاوازە وەک زەمەنی رووداوەکەوە هەیە، هاوکات نەدۆزینەوەی ناوی گونجاویش! کە هەڵگری سیفاتی خاوەن حەرفەکە بێت، کاک سەلام دوو حەرفی بەکار هێناوە (م ، هـ) زۆربەی خوێنەر نازانێت مەبەستی کێیە، بەدڵنیاییەوە کەسانێکیش دەزانن مەبەستی کێیە.. ئیدی ئەم گرتن و گواستنەوەیەی سۆران بۆ (زیندانی گەڤەڕ) و لێکۆڵینەوەکەی پانزە ڕۆژ دەخایەنێت و بڕیار دەدەن تەسلیم بە حکوومەتی ئێراقی بکەنەوە، گومانی تێدانییە سزاکەی ڕاستەوخۆ (سێدارەیە) چونکە سۆران خۆی لە (زیندانی هەیئە) ڕایکردووە و حکوومەتی ئێراقی کون و کەلەبەر نەماوە بۆی نەگەڕێت، هەڵبەتە پاش لێکۆڵینەوەیەکی ورد کە رۆماننووس ئاماژەی پێداوە و دەڵێت: ( پێش نیوەڕۆ بردمیانەوە بۆ لێپرسینەوە، ئەمجارەیان سەربازێکی تر تەرجومەی دەکرد، تۆزێ باشتر لە یەک دەگەیشتین، ئەفسەرەکە ڕاستەوخۆ کەوتە پرسیار. «ناوت؟»

وەک شەو بڕیارم دابوو کە ناو و نیشانی خۆم بگۆڕم و خۆم بە کەسایەتی نوێ پێشکەش بکەم، وتم: «حەسەن عەبدولقادر!».

ئەفسەرەکە وتی: ئاوا..
ئەی خەڵکی کوێیت؟.
بە دڵنیاییەوە وتم: سووریا.
ئەفسەرەکە بە وردی سەیری دەکردم و وتی: «کوێی سووریا»؟
خۆم قیت کردەوە، وتم: «قامیشلی».
ئەفسەرەکە یەکێک لە چەکمەجەکانی مێزەکەی کردەوەو زەرفێکی ئەستووری دەرهێناو زۆر بە شێنەیی ناواخنی زەرفەکەی دەرهێناو پاشان دایە قاقای پێکەنین، پاسەپۆرت و نامەکان لەسەر مێزەکە بوون، ئەفسەرەکە پاسەپۆرتە عێراقییەکەی هەڵگرت و برێ تاوتوێی کرد و پاشان کەوتە بەراوردی خۆم و وێنەکەم و دوایی بە تەوسەوە، وتی: «سووریا؟ قامیشلی؟!».
هەموو شتێ تەواو بوو، هیوای خۆگۆڕین و خۆگێلکردن بەهیچ دەرچوو. پاسەپۆرت و نامەکان بەڵگەنامەی حاشاهەڵنەگر بوون، ئەفسەرەکە بە مۆڕەیەکەوە کە غەزەبی لێ دەتکا وتی: «تۆ عێراقیت و کابرایەکی یاخیشیت».
نکوڵی، بێ عەقڵیەتی دەنواند، بۆیە وتم: «وایە، بەڵام من بابایەکی یاخی نیم و پێشمەرگەم».
ئەفسەرەکە چاوی پەڕییە پشتی سەری و بە هەموو هێزی قیژاندی بەسەرمدا: «دەڵێم تۆ یاخیت».ل٨٣٥ بوژانەوەی ژیلەمۆ) ئەگەر بەراوردی شێوازی لێکۆڵینەوەکە بکەین جیاوازی هەیە لەگەڵ (زیندانی هەیئە) چونکە ئەمەی (گەڤەڕ) تا رادەیەک باشە .. ئەشکەنجە و هەڵواسینی تێدا نەبووە، بە حیساب ئەمان دەوڵەتی کەمالیزم و شوونهەڵگری ئەورووپین، هەربۆیە سۆران لەکاتی "مەنەلۆگ" کردنەکەی هەوڵیدابوو بەم شێوەیە خۆی دەرباز بکات، بەڵام هێندە نابا دلێرانە دەڵێت من "پێشمەرگە"م ئای لە ناوی پێشمەرگە چەندە پڕ هەیبەت، بەها

و گەورەییە ئەم ناوە، چەند شەڕەفمەند و شکۆدارە هەڵگری ئەم ناوە، دانان و ئاماژەدان بە هەبوونی "وەرگێڕ" زۆر گرنگە ؛ چونکە مامۆستا سەلام بەدرێژایی مانەوەی لە زیندانی هەیئە کە دارو دەستەی هەموو عەرەب بوون ئاماژەی بە هەبوونی وەرگێڕ نەکردووە، ئەگەر هەبوو بێت یان نەبوو بێت، چونکە یەکێکی وەکو (خدر) کە لەکاتی کوژاندنەوەی کارەبا و بەهۆی زۆری پلەی گەرماکە بەداخەوە شەهید بوو، پیشەی "شوان" بووە، ئایا خدر چۆن توانیوویەتی بەرگریی لەخۆی بکات لەکاتی لیکۆڵینەوە!؟ دەکرا ئاماژە بەمە بدرێت، وەک چۆن لە زیندانی گەڤەڕ باسی موعاناتی نەبوونی وەرگێڕی کردووە؛ تا وەرگێڕ دەهێنن،

دوای ئەوەی سۆران باس لە شێواز و پێکهاتەی زیندانەکە دەکات، چۆن بەڕێوەبەری زیندانەکە شەوان هاتۆتە لای بەندییەکان و مەجلیسی لەگەڵ بەستوون، هەر ئەمەش وادەکات لەو دەرفەتانەی بۆشی دەگونجێت نەیکوژێت، تا دەرفەتی هەڵاتنی بۆ بلوێت، هەمیشە مامەڵەی باش و مرۆڤدۆستانە هەڵگری پەیامی مانەوە و درێژەدانە بە ژیان، لە ڕۆمانی (خانەی مردووان) کە نووسەرەکەی دۆستۆفسکییە و باس لە ئەزموونی زیندانی خۆی دەکات لە "سریبیریا" لەنامەیەکدا دەڵێت: (ڕەنگە خودا منی بۆ ئەم زیندانە ناردبێت هەتا بە قووڵی لە جەوهەری "ئازار" تێبگەم و بیگوێزمەوە بۆخەڵکی !) ، بەڵێ کاریگەری رۆمان و یادەوەری بۆ کۆمەڵگەی هۆشیار زۆر زۆرە، دەکرێت ببێتە هۆکاری گۆڕینی زۆر شت، هەر بۆیە کاتێک شازادە و جەنەڕاڵێکی ڕووسی بەناوی (نیکۆلای ئۆرلۆف ١٨٩٠- ١٩٦١) لە نامەیەکدا بۆ "تزار" ی ئیمپڕاتۆر داوای لێکرد ئەو سزایانە لە زینداندا نەمێنن کە دۆستۆفسکی ڕاستگۆیانە لە ڕۆمانەکەیدا باسی کردووە، سەرەنجام ئەم سزایانە بەتەواوی هەڵگیران. لە ڕەخنەی هاوچەرخ و ئەدەبیاتی "میتافیکشن"دا ئەو ڕەهەندە گرینگانەی جێگەی خوێندنەوە و ئاماژەکانی ڕۆمانن یان بە گشتی جێی

ئاماژەی هونەری گێڕانەوەن و  مشتومڕی لەسەر دەکرێت، بریتیین لە سیمۆلۆژیای (شوێن، وێنە، ڕەنگ) دەتوانم بڵێم ڕۆمانی بوژانەوە لە مەسەلەی شوێن و هەتا وێنەیش پشکیی شێری بردووە، لە گواستنەوەی وێنەی ڕووداوەکان ئەگەرچی بەزمانێکی سادەیش بێت، کاروانێک تابلۆی لە زیهنی منی خوێنەردا جێهێشتووە، هەروەک لە وەسفی دوا دیمەنی بردنی لە لایەن عەریفێک و دوو سەرباز بۆ سنوور و تەسلیمکردنەوەی بە حکوومەتی ئێراقی دەڵێت: (عەریفەکە سەرنجی دا کە ناتوانم بە کەلەپچەوە (چا) بخۆمەوە، بۆیە کلیلەکەی لە گیرفانی دەرهێناو کەلەپچەکانی کردەوە.

عەریف و سەربازەکان سەرقاڵی چا خواردنەوە بوون، دەستم کرد بە گیرفانمدا و پەنجا هەزار لیرەی تورکیم دا بە چایچییەکە، عەریفەکە ڕاپەڕی و کەوتە تێخوڕینی چایچییەکە و دەیویست پارەکەی لێ بستێنێتەوە، لەوە دەچوو زیاد لە پێویستم دابێتی، چونکە مشتومڕێکی توندوتیژیان بوو، هەلم لە کیس خۆم نەدا، دەستەکانم ئازاد بوون، لە چاوترووکانێکدا پاڵم بە دەرگای چایەخانەکەوە نا و ڕووەو جیهانی ئازاد هەڵاتم.

لە چوارڕێیانی شاردا، نزیکەی سەد مەترێک، دوای ڕاکردن، کەوتم بەسەر عارەبانەیەکی دەستیی لەعنەتیداو عەریفەکە و سەربازەکان سواری سەرم بوون، ئیدی کار لە کار ترازا و بە هەموو هێزم بەرگریم لە خۆم دەکرد، شەڕێکی نابەرامبەر بوو، دوو سەرباز و عەریفێک پڕچەک و منی بێ چەک، ئەوان هەوڵیان دەدا کەلەپچەکە بکەنەوە دەستم و منیش، بەهیچ شێوەیەک مۆڵەتم نەدەدا، پەلەقاژێی بەردەوامبوونی ژیان بوو، هێزێکی خوایی بە لەشمدا ڕۆچوو بوو، هەرچەندیان دەکرد نەیاندەتوانی کەلەپچەکە بکەنەوە دەستم و منیش پەلاماری تفەنگی عەریفەکەم داو هەوڵی ستاندنیم دەدا. سەربازەکان بە قۆناغە تفەنگ

دەیاندا بە شان و پشتما و هەوڵی ئەوەیان دەدا دەستم لە تفەنگی عەریفەکەیان بەردەن، هێزی من و عەریفەکە، قابیلی بەراورد نەبوو، ئەوێکی پەنجا ساڵە لەگەڵ مندا دەرنەدەچوو.

یەکێک لە سەربازەکان تاکێک کەلەپچەی لە مەچەکی چەپم گیر کردو منیش هەر بگرەو بەردەم بوو لەگەڵ عەریفەکەدا و دەستم هێندە لە یەک دوور خستبوو کە تاکی کەلەپچەکە نەیگاتێ. شەڕی نێوان مردن و ژیان بوو، ئەوان دەیانویست بەرەو مەرگم بەرن و منیش هەوڵم بۆ ژیان دەدا.

لەوکاتەدا ئەفسەرێکی تورک پەیدابوو، خەڵکی ناو شار، تا دەهات، لە دەورمان کۆدەبووەوە پاسیڤانە سەیری ئەو شانۆ ترسناکەیان دەکرد. یەکێک لەناو خەڵکەکەدا غیرەت گرتی و هاواری کرد: «بۆ دەیانەوێ بتگرن؟».

دەستم هێندەی تر لە تفەنگی عەریفەکە گیر کرد و منیش پڕ بەدەم هاوارم کرد: «پێشمەرگەم!».

جەماوەرەکە وردە وردە خرۆشا و کەوتنەوە جووڵە، بەڵام بەشدارییان لە شەڕەکەدا نەکرد، گوێم لە دەنگی خەڵکەکە بوو کە دەیانوت: «بەسە.. بەسە.. هەی کافرینە».

لەژێر قۆڵی عەریفەکەوە چاوێکی پەلەم بەناو خەڵکەکەدا خشاند، ئەفسەرەکە دەمانچەکەی دەرهێناو دەستی کرد بە تەقە بە هەوادا، ئەو ڕەفتارە جەماوەرەکەی بە تەواوی خرۆشان و منیش هاوارم کرد: «پێشمەرگەم.. پێشمەرگەی بارزانی».

ناوهێنانی بارزانی، خەڵکەکەی تەواو خرۆشاند و تەوژمێکی بەهێزی بە غیرەتی خەڵکەکە دا و یەکسەر پەلاماری سەربازەکانیان دا و منیان لە چنگی سەربازەکان و عەریفەکە دەرهێنا، منیش هیچ هەلم لە کیس خۆم نەداو کەوتمەوە ڕاکردن. ل٥٩٥بوژانەوەی ژیلەمۆ) ناو هێنانی مەلا مستەفای بارزانی لای تورکەکان قەدەغەبوو بەهۆی شۆڕشە

نەتەوەییەکەیەوە، بەڵام لای هاوڵاتییە کوردەکان بارزانی ڕەمزی کوردایەتی و بەرخودان بووە، هەروەک (موساعەنتەر ١٩٢٠-١٩٩٢) لە کتێبی بیرەوەرییەکانی باسدەکات و دەڵێت: لەسەر ڕووداوەکانی شەواف و قاسم وتاریَ دەنووسیَ بەناوی( شەمەڕی کێیە)؟. دەدرێتە دادگا و دادوەر لێی دەپرسیَ: تۆ بۆچی بارزانیت خۆش دەویَ و لە عەرەبیش پەست و تووڕەی،(...) موسا پرسیارەکە پێچەوانە دەکاتەوە و لەدادوەر دەپرسیَ: بۆچی ئێوە ڕقتان لە بارزانی دەبێتەوە و عەرەبتان خۆش دەویَ؟(...) لەبەر چ هۆکارێک لە بارزانی پەستیت، منیش لەبەر هەمان هۆکار خۆشم دەویَ". ل٢٣٤)

**ڕەهەندی شوێن لە کۆرۆمانی بووژانەوەی ژیلەمۆ :**

نووسەری سەلیقەمەند هەمیشە لە یەکێک لە زاویەکانی نووسینیدا، دەیەوێت خوێنەری ناوەخۆیی و بیانیش بە کلتوور، نەتەوە، خاک و پیرۆزییەکانی خۆی ئاشنا بکات، دۆستی قەڵەم و نووسین ناتوانێت ببێتە "غەواس" لە بەحری کلتوور و زمانی هیچ نەتەوەیەکی دیکە، هەتا خەتمی هەموو ئەو جوانییانەی نێو کلتوور و زمانی خۆی نەکات، هەروەها ناشتوانێت وەک نووسەرێک مۆرکی "نەتەوە"کەی لە فەزای ئەدەبی "دنیا"دا خزمەت بکات و بیپارێزێت، بۆیە بەئاگایی لە ئەدەب کلتوور و نەریتەکانی نووسینی جیهان بۆ خودی نووسەر زۆر گرینگە.. هەر بۆیەشە ئەگەر سەیری بەئاگایی و وردیی نووسەری (بووژانەوەی ژیلەمۆ) بکەین وەک نووسەری دەقێکی ڕیالیست (واقیع)ی مەسەلەی (شوێن و جوگرافیا)ی کردووەتە جێی بایەخ و سنوورە دەستکردەکانی تێکشکاندووە، هەڵگری مانەفێستی زیاتر لە قەزیەیێکە (پرسێکە)؛ چونکە بەر لە هەر شت دەقی ڕیالیستی ڕاڤە و هەڵێنجانە بۆ خودی واقیعی سەردەم، ڕووداو، شۆڕش، ئاکار و قۆناغەکان، ئەمە لە گێڕانەوەیەکی

غەیرە کتێبێش جێ دەبێتەوە، بەنموونە مامۆستا (تەحسین هەرشەمی) وەک کەسێکی خاوەن ئەزموونی زیندان بۆمانی باسکرد: کەوا ساڵی١٩٨٧لە زیندانی دائیرەی ئەمنی هەولێر، ساڵێک و یەک مانگ زیندانی بووم، ئەوەی بیرم ناچێتەوە دیمەنی ئەو فلینە خوێناوییانە بوو خوالێخۆشبوو (مام سابیر دەروێش ئەحمەد)ی برای پێشمەرگەی دێرین (مام غەفور) بۆی باسکردم کە بۆچی شوێنەواری پەڵەی خوێن بەم فلینانەوەیە، گوتی: کوڕم ئەوە پێش ئەوەی ئێوە بهێننە ئێرە، جەلادەکان خەڵکێکی زۆر ژن و منداڵ و گەنج و پیریان هێنایە ئێرە .. زۆربەیان بریندراربوون و بە چەکی کیمیاوی لێیاندرابوو، هی دۆڵی "بالیسان " بوون و ئیدی لێرەیان هێشتنەوە ماوەیەک دوایی بردنیان، نازانم چییان بەسەرهات بەڵام گومان دەکەم کەسیان نەمابن. مامۆستا هەرشەمی ئەوسا تەمەنی ١٧ساڵ بووە و دەڵێت لێم پرسی یانی ئەو فلینانە هی ئەوان بوون؟ مام سابیری هاوزیندانیش دەڵێت: نەخێر فلینەکان هی ئەوان نەبوون .. ئەو چەند ڕۆژەی ئەوانیان لێرە هێشتەوە، منداڵی ساوا و بچووکیان زۆر لەگەڵ بوو، منداڵەکان زۆربەیان بریندراربوون و خوێنیان لێ دەڕۆیشت، بەداخەوە هەندێکیان لێرە شەهید بوون ئەو منداڵانە و ئیدی ئەمنەکان بە ئێمەیان گوت کەوا بۆمان هەیە تەرمە بچووکەکانیان، لەناو ئەو تەپەدۆرە فلینانەدا دابنێین تا دەیانبەن بۆ شوێنێک، هەرشەمی بەکەسەرەوە گوتی: ئەوسا من لە تەرمی چۆڵەکە و هەندێ بەرخی بە غەدر سەربڕاو زیاتر، هیچ تەرمی دیکەم نەدیبوو. تەنیا توانیم لە مێشکمدا چەند منداڵێکی کوردی جوانی نورانی، لەناو مەلۆتکە سپیە پێچراوەکانیاندا بهێنمە پێش چاوم، ئەو منداڵانەی زۆربەمان هی خۆمان و هی کەسوکارمان دیتوومانن و لەباوەشمان کردوون و ماچمان کردوون و بۆنمان کردوون، لەدەقی نووسراویش ئەوا زۆرمان هەیە بۆ نموونە ڕۆمانی (شاری مۆسیقارە سپییەکان)ی ڕۆماننووس

(بەختیار عەلی)یش سەیرکەین لە بەشێکی زۆریدا پڕژاوەتە سەر کارەساتی ئەنفال .. بێگومان ئەم کارەساتە واقیعییەش بارگاوییە بە شوێن و جوگرافیای نەتەوەیەک، یان (گوستاڤ فلۆبیر ١٨٢١_١٨٨٠) لە ڕۆمانی "مادام بۆڤاری"دا بەسەرهاتی خانمێک بەناوی ئیما دەگێڕێتەوە، لەوێش ڕەوتی ڕووداوەکان و شوێن و دابونەریت هەموو لەپاڵ واقیعیدا ڕوودەدەن، هەروەها ڕۆمانی (خەمی مەستوورەی) میران ئەبراهام و ڕۆمانی (شەو) ی ( ئیلی ویزل ١٩٢٨_٢٠١٦) هەڵگری خەڵاتی (نوبلی ١٩٨٧) باس لە کۆمەڵکوژی هۆلۆکۆست دەکات لەلایەن دەوڵەتی دیکاتۆری نازییەوە، لای مامۆستا سەلام عەبدوڵلایش ئەم بابەتی ڕەوتی شوێنە زەقە و هەوڵی داوە لە بەستێنی ڕووداوەکان تایبەتمەندیی ناوچەکان وێنا بکات، هەر لە ڕووی جۆری جلوبەرگ، خواردن، سرووشت و .. تاد، بۆ نموونە دەقنووس لە باسی زوو لەخەو هەستان و خواردنی بەیانیانی گوندنشینەکان نووسیویەتی (وەک نەریتی گوندییەکان سەید شەریف تاریکوڕوون لەخەو هەستا، بەو پێیەش ئێمە لەگەڵی هەستاین و دوای خواردنی بەرچاییەکی سەرپێیی، تەنیا نانی وشک و جۆرە پەنیرێکی بۆندار بوو کە خواردنی بۆ ئێمە زۆر نامۆ نەبوو، بەڵام لەوە زیاتریش چنگ نەدەکەوت و دەبوو ئێمە مەمنوون بین)ل ٤٣٦ بووژانەوەی ژیلەمۆ، گواستنەوەی ئەم دیمەنانە جگە لەوەی خوێنەر بەرەو ئەو حەقیقەتە دەبات کە تاکی خەباتگێڕی نەتەوەیی پێیدا تێپەڕیوە، دەبێتە شارەزابوون و دەوڵەمەندبوونی پاشخانی مەعریفیش بۆی، بەتایبەت کە باس لە ساڵانی زووی شۆڕشی شاخ و بێ دەرەتانی پێشمەرگە لە نێو ساردی و برسێتی و مەترسیی شاخ دەکات، ئەگەر دەستگیرۆیی ئەو ماڵە ئاژەڵدار و وڵاخدار و کۆچەرە گەرموگوڕانەی دامێن و ناو شاخ و گوندە دوور و سەر سنوورییەکان نەبان، هەرگیز ئەم شۆڕشە نەیدەتوانی جارێکی دیکە ببووژێتەوە، لەکاتێکدا هەموو هاتن

و چوونی پێشمەرگە هەر پیادەڕۆیی و بڕینی ڕێی سەخت بووە، تەنانەت وەکو پێوانەیش هەر ئەم دۆڵ و شاخانەیان بۆ زانینی مەودای دوور و نزیک بەکار هێناوە، ئەوەنییە دەڵێت: (میانەی نێوان دۆڵەکان تا دەهات کورتتر دەبوەوە، بۆیە کە دەمەو ئێوارە، پێش تاریکبوون گەیشتینە کۆتایی دۆڵەکان و چەمی گادەرمان تێپەڕاند، من لای خۆمەوە دۆڵەکانم ژماردبوو، لە کۆتاییدا گەیشتە (٢٥) دۆڵ، بۆیە خۆم لە دکتۆر چالاک نزیک کردەوە و سیخورمەیەکم لە کەلەکەی دا و وتم: «ئەوەتا سەرتاپای ئەم دۆڵانە (٢٥) دۆڵن، بۆیە کات لێرە بە کاتژمێر ناپێورێ، بۆیە ئەگەر لێیان پرسیت، تۆش لەمەودوا ئەو پێوەرە بەکار بهێنە».

دکتۆر چالاک بە سەرسوڕمانەوە وتی: «جا کەس لەو پێوەرە تێدەگات؟!» یەکسەر وتم: «بەڵێ ئەی نازانی لای خۆشمان، کە پێشمەرگە پرسیاری ماوەی نێوان دوو گوند دەکات، بە کاتژمێر وەڵامت نادەنەوە، بەڵکو دەڵێن: هەر جگەرەکێشانێکە، کەمتر یان زیاتر»ل٤٩٧ بووژانەوە) ڕۆماننووسیی پشوودرێژ لە گێڕانەوە و شێوازدا ، تەعریفێکی شوێندار لە فەرهەنگی هونەری گێڕانەوە بەدەستدێنێت، بە بڕوای من ناکرێت نووسەری ڕۆمان بەهیچ تیۆرێک وابەستە بکرێت، تێفکرینی سەربەست دەتوانێت دەقی هەمەچەشن و چێژدار بەرهەم بێنێت، پێویستە نووسەر بە شێوازی تایبەت بەخۆی بناسرێتەوە، نەک لەبۆتەدانی بە دانە تیۆرێک، قەیدی چییە ئەگەر دەقێک بەر هەر تیۆرێک کەوت ئاشنایەتییەکی لەگەڵ پەیدا کرد، (سارتەر) کاتێ باسی (فلۆبێر ) دەکات دەڵێ: فلۆبێر هەموو شتێک نائاسایی دەکات و ڕووداوە سادەکانی ژیانیش دەگۆڕێت بۆ چاوگی سەرسووڕمان"، کەواتە بووژانەوەی ژیلەمۆیش ئەگەرچی سادە داڕێژرابێت، بەڵام هەمەچەشنی لە بەرکەوتەی ڕێبازو تیۆرەکان، دەیخاتە خانەی کارە جوانەکانی سەردەم و دەقێکی ناوازەی نێو ئەدەبی هاوچەرخ. هەر لەبارەی گواستنەوەی

دیمەنە شوێنی و عادەتییەکان و پێشوازی ماڵەکان بۆ پێشمەرگە، ڕۆماننووس نووسیویەتی: (جۆری چەکەکانی سەر شانمان و پۆشاکی خاکیمان، بۆخۆی پێناسەمان بوو کە ئێمە خەڵکی ئەو ناوە نین و چەکداری ئەودیوین.

خاوەن ماڵیش مروڤێکی بە سەلیقە بوو، چونکە هیچ لەسەری نەڕۆیشت و باری سەرنجێکی نەدا، بۆیە ئێمەش بە بێدەنگی وەژوورکەوتین.

دیاربوو خاوەن ماڵ تاڕادەیەکی باش دەوڵەمەندبوو، چونکە ژووری میوانەکەی دیوەخانێک بوو بۆ خۆی، فەرشی نوێ و گرانبەها، سەرینی ئەستووری پاڵ دیوارەکان و دۆشەکە ڕەنگاوڕەنگەکان نیشانەی توانای دارایی ئەو بوون.

من بەدەم خواردنەوەی دیشلەمەیەکی گەرمەوە، سەرنجم دایە ئەو هەموو بەتانییە تووکنەی کە لەسەریەک لەسووچێکی ژوورەکەدا هەڵچنرابوون، چاوەڕێی ئەو ساتەم دەکرد کە کاتی نووستن دێت و چۆن خۆم دەخزێنمە نێوانی.

نێڵەنێڵی سۆپای گەرمی ژوورەکە مژدەی شەوێکی ئارامی دەبەخشی، دیشلەمەش یەک لەدوای یەک دەهات، بۆیە عەزیز لەلاوە بە چرپە پێی وتم: «بە دیشلەمە تێرمان نەکەن؟». هەر بە سەربزواندن وەڵامم دایەوە، بەڵام دیاربوو باش حاڵی نەبوو، بۆیە وتم: «ئەمە نەریتە. تۆش ئارام بە». هەمیشە خواردنەوەی "چا"ی زەرد و دیشلەمە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان باوە و پێشکەشکردنیشی بەشێکە لە ڕێزگرتنی میوان و بەخێرهێنان، ئەوجا لەگەڵ گواستنەوەی ئەم نەریتانە کە باسی خواردن و جلوبەرگی تێدایە؛ وەک چۆن لە دیوی ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەبوو پێشمەرگەکان لەبری جامانە پشتێنەکانییان بکردایە سەر وەک مێزەر، جەمەدانیش لە پشتییان ببەستن، هەروەها لە دیوی باکووری

کوردستانیش لەبری ڕانک و چۆغەی کوردیی لەسەر فەرمانی (ئەتاتورک) دەبوو چاکەت و پانتۆڵ بپۆشن، ئەمەش وەک هەوڵێک بۆ سڕینەوەی فەرهەنگی رەسەن و زمانی کورد. لێرەدا (موسا عەنتەر (١٩٢٠-١٩٩٢)م هاتەوە یاد کاتێک لەبیرەوەرییەکانیدا دەڵێت: لە (مێردین) قسەکردن بە کوردی سزای دارایی و جەستەیی لەسەر بوو، ئەو شارە دەتووت کامپی کەڕولاڵانە خەڵکی بە ئیشارەت قسەیان دەکرد.

دەگێڕێتەوە و دەڵێت لە گوندەوارەکانەوە خەڵک بارەداریان بە سواری کەران بۆ فرۆشتن دەهێنا مێردینێ، ئەو دارانە پەنجا .. شێست قروشی دەکرد گەر باش با ئەوە پێنج-شەش لیرەی دەکرد، ئەو گوندییە کوردانە کاتێ لە کەر دەخوڕنەوە دەڵێن: (چۆ - حەچە)، لە مێردین کاتێک بە کوردی بە کەرەکە دەڵێن حەچە، جەندرمە کەمینی بۆ داناون و بەسەریاندا دەدەن و تێر قسەیان پێدەڵێن و بە زەبروزەنگ دەستگیریان دەکەن، کابرای گوندیی قوڕبەسەریش تورکی نازانێت بە کوردی بەرگری لە خۆی دەکات بێئاگا لەوەی پێشتر خۆی ڕووبەڕووی تاوانێکی گەورەتر کردۆتەوە و لەسەر قسەکردن بە کوردی دەستگیرکراوە. یەکێک لەو گوندییانە لەسەر قسەکردن بە کوردی دەستگیر دەکرێت کەوا خزمی دایکی مووسا عەنتەر دەبێت، دوای ئەوەی بارەکەی بە ٥ لیرە فرۆشتبوو، بە ١٢ لیرە غەرامەی دەکەن و دوو ڕۆژیش دەستگیری دەکەن و دواتریش تێروپڕی لێدەدەن ئینجا ئازادی دەکەن. دوای سێ مانگ و نیویش دەڕۆن بۆ گوندەکەیان ئەو ٧ لیرەی دیکەی لێدەسێنن کە قەرزاربوو بیداتە حکوومەت.. / کتێبی یادەوەرییەکانی موسا عەنتەر).

دەکرا زمان و شێوەزاریش گرنگی پێ بدرێت، نەک یەک شێوە ئاخافتنی کارەکتەرەکان، کە ئەم کێشەیە لای زۆربەی ڕۆماننووسە کوردەکان هەیە، کەچی لە ڕۆمانی عەرەبیدا تەماشای "تۆفیق حەکیم" بکە سوود لە زمانە گشتییەکەی ناو خەڵک وەردەگرێت، لە بەرانبەریشدا

“نەجیب مەحفووز" لە رۆمانەکانیدا ئەو زمانە عەرەبییەی پێی دەڵێن (فصحی) بەکاریهێناوە، نووسەر و سینەماکار فەرزین کەریمیش لە رۆمانی (زمانبڕین) لەسەر زار و ئاخاوتنی کارەکتەرەکانی ڕۆمانەکەوە زۆر بە وردی گرنگی بە دیالێکتەکان داوە، باش بوو باسی ڕۆمانی زمانبڕینم کرد، نووسەر لەو ڕۆمانەیدا بۆ شارەگی کارکردنەکەی قەدەغەکردنی زمانی کوردی لە باکووری هەڵبژاردووە، کە لە پەرەگرافی پێشەوە سەرنجم لەبارەیەوە داوە.

هەروەها لەبارەی ناوهێنانی شوێن و جوگرافیای ڕۆمانەکە، ئەوا شادەماری دەقەکە بریتییە لە زۆریی (شوێن) و ڕۆمانێکی هەمیشە جولاوە، بەردەنگ بێ ماندووبوون لەگەڵ دەستپێکی خوێندنەوەی دەکەوێتە گەشت، بە شێوەی قاچاغ و پیادەڕۆیی لە سنووری چوار وڵات، (کوردستانی گەورە) بە زەویی نشێوی دۆڵ و هەورازی شاخ و چیاکاندا تەی دەکات، بۆ نموونە: لە کوردستانی باشوور هەر لە سلێمانی بگرە تا کەرکوک، چەمچەماڵ، قەرەداغ، ناوچەکانی پشدەر، قەڵادزێ، نێوزەنگ، چۆمان و دۆڵی باڵەکایەتی) لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان ئەوا لە (شنۆ، خانە، سەردەشت، ڕەزاییە ، بانە و.. تاد) لە باکووری کوردستان (هەر لە شەمزینان، گەڤەڕ ، دیاربەکر، وان، ماردین، جەزیرە و ..تاد) پاشانیش بۆ ڕۆژئاوای کوردستان (نەسیبێن و قامیشلو) تێپەڕین بەم ناوچە فراوانانە لەگەڵ پۆلێک هاوبیر کە پەیوەندی نێوانیان بنەمای سەرکەوتن بوو لە یادگەی بەهێزی پاشخانی ئەو بیرەوەرییە دوور و درێژەی ڕۆماننووس، بۆیە کاتێک ڕەخنەگری ئێراقی “حەیدەر جومعە عابیدی“ دەڵێت: (ڕۆماننووس دەبێت تایبەتمەندیی ڕووکار، دەروونی و ئاکاری کارەکتەر بە خوێنەر نیشان بدات، بە واتایەکی دیکە کارەکتەرسازی بکات)، لەم ڕووەوە دەقنووس سەلام عەبدوڵڵا گرنگی باشی بە مەسەلەی کارەکتەر دابوو، دیالۆگەکان جێی سەرنج بوون،

هەریەکە و چێژێکی بەخشیبووە دەقەکە بەتایبەت (ملازم ئەنوەر مەجید سوڵتان ١٩٤٤_١٩٧٩) وەک کارەکتەری پاڵەوانی جەنگەکان کاتێک سۆران دەگاتە شاخ و دواتر ملازم ئەنوەر دەبینێتەوە پاش ئەوەی دەمێک بووە نەیدیووە، ئیدی زۆر پێی سەرسام دەبێت، بۆیە لەنێو ڕۆمانەکە دەڵێت: (جارێکیان وتم: چ ئامۆژگارییەکت هەیە بۆ ئەم پێشمەرگە تازانەی هاتوونەتە دەرێ و بێ ئەزموونن، ئایا پێویست بە ڕاهێنانیان لەسەر چەک و فێربوونی تەکنیکی شەڕ ناکات؟

لە وەڵامدا وتی: «چەکەکانمان ئێستا چەکی سووکن، فێربوونی ئاڵۆزییەکی ئەوتۆی تێدا نییە و خۆیان یەکتر لەسەر بەکارهێنانی فێر دەکەن و مەسەلەکە زۆر ئاسانە و هەموو بە زوویی فێر دەبن بەڵام...».

چاوی گێرا بەنێوانماندا و وەک وزە و توانا و بەهرەمان بخوێنێتەوە وتی: «تەنیا شتێک کە پێشمەرگەی نوێ پێویستە بیزانێ و پەیڕەوی بکات (هێمنی)یە، هێمنی، لەکاتی شەڕدا..».

تەنیا (٣٠) چرکەی سەرەتای شەڕ هێمنی و ئارامی خۆی لەدەست نەدا و نەشڵەژێ و دووچاری دڵەڕاوکێ و تۆقان نەبێ. هێمنی ئەو ساتە کەمە بە بڕیار لەسەر هەڵسوکەوت و بڕیارەکانی لەمەودوا دەدات و دەزانێ چی پێویستە بیکات. هەر ئەو (٣٠) چرکەیە ئارامی ڕابگرێ لە شێوەی شەڕەکە دەگات. لە ڕاستیدا زۆربەی زۆری شەهید و بریندارەکانمان هەمیشە لە سەرەتای شەڕدایە، بۆیە داوای من لە پێشمەرگە تازەکان تەنیا پاراستنی هێوری و ئارامییانە لە کاتی شەڕدا، ئیتر بوێرانە دەتوانێت ئازایەتی خۆی نیشان بدات. لەم شەڕەشدا، ئەنوەر، وەک هەمیشە، قارەمان بوو) مخابن ئەنوەری سەرکردە و لێزان گیڤارا ئاسا دوای ئەزموونی باشووری کوردستان ڕوودەکاتە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بۆ بەهاناوەچوونی کوردەکان و دژی داگیرکاری سوپای ئێرانییەکان لە ساڵی (١٩٧٩) مولازم ئەنوەر شەهید دەبێت. هەروەها

کارەکتەری جووتیار وەک دەلیلێک زۆر کارامەو لێزانە، شێخ سدیقیش بەهەمان شێوە تەنانەت دوای ئەوەی لەگەڵ تەقەی خۆشی پێشمەرگەکان (بارگیر)ەکەی ڕادەپەڕێ و لەشاخ دەکەوێتە خوارەوە، سەرەڕای خەمباربوونی .. ئارامییەکی باش دایدەگرێت، یان کاتێک (خاڵە عەفان)ی هاوڕێی منداڵیی دەبینێت دەکەوێتە باری نوستالۆژیای منداڵی و دەڵێت: (هەموو چاوەڕێی گەیشتنی چەکەکان دەکەین کە لە سووریاوە بۆمان دێت، بۆیە پێشمەرگەکان بە سەر ماڵانی ئەم دێیانەدا دابەش کراون».

لای نیوەڕۆ کۆمەڵێ برادەری منداڵیم بەدی کرد کە زۆر دەمێک بوو نەمدیبوون. یەکێک لەوانە عوسمان قادر منەوەر بوو کە لەوێ بە "خاڵە عەفان "ناسرابوو، کە لە ناوەڕاستی ساڵەکانی (٥٠)دا پێکەوە لە قوتابخانەی سەرەتایی بووین. بینینی ئەو، کۆمەڵێک یادگاری منداڵی بیرخستمەوە.

عوسمان کوڕێکی ڕووخۆش و قسەخۆش و پێشمەرگەیەکی خاوەن ئەزموون بوو، ئەو لە شۆڕشی ئەیلوولیشدا بەشداری کردبوو، بۆیە وەک پێشمەرگەیەکی قاڵبووی مەیدانی خەبات و شۆڕش دەناسرا.)ل٥٦٧ بووژانەوە

دواجار کارەکتەری (خەسرۆ) ئەویش دەلیلی ڕێگە دەبێت، لەو کاتەی بەهۆی بەفرە زۆرەکە ڕێگەیان لێ ون دەبێت، دەکەونە دەست پاسدار و سەربازانی ئێرانی، لەپێناو پاراستنی هاوڕێ پێشمەرگەکانی خۆی دەکوژێت، بەداخەوە دوای شەهیدبوون و ئازادبوونی کوردستانیش گۆڕی خەسرۆی پاڵەوان هەر لەنێو چیا جێماوە! لەکاتێکدا دەبوو بکرێتە ڕەمزی بەرخۆدان و وەفا وەک (سەربازی ون) گرینگی پێ بدرێت.

**ڕەهەندی دەستپێک و کۆتایی ڕۆمانەکە:**

نووسەر و ڕەخنەگری کورد (حەمەسەعید حەسەن) دەڵێت: (نووسەر دەبێت سەروەختی گێڕانەوە هەندێک سەرەداو نیشان بدات، تا پشکۆی کونجکۆڵیی خوێنەر زێتر بگەشێنێتەوە و ناچاری بکات دوای بەسەرهاتەکە بکەوێت. هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی، پێویستە داوێکی سوور هەبێت کە بۆ خوێنەر ئاسان بێت دوای بکەوێت، ئەو داوە سوورە زادەی پێوەندییەکی پتەوی نێوان پێکهاتەکانی چیرۆکەکەیە ئەگەر نووسەر چیرۆکەکەی بە کراوەیی جێ بهێڵێت، ئەوە یاریدەی خوێنەر دەدات، بیر بکاتەوە و خەیاڵ وەگەڕ بخات، تا کۆتاییەکی بۆ ببینێتەوە) لەبەر ڕۆشنایی ئەم قسەیەی مامۆستا حەمەسەعید حەسەندا کە لە وتارێکی نێو ئەکاونتی خۆی لە تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووک بڵاوی کردووەتەوە، دەبینین شێوازی کۆتاییهێنانی ڕۆمانەکە، لەگەڵ ئەوەی سۆران ئازادیی بەدەستهێنا و توانی جارێکی دیکەیش لە زیندان ڕابکات، بەرەو هیوا و هەناسەی سەربەستیی، بەڵام کۆمەڵێک پرسیاری بێ وەڵامی لای خوێنەر بەجێهێشت، لە ڕووی تەکنیک و زمانەوە کۆتاییەکەی باشتر دەبینم وەک سەرەتا، نووسەر توانیوویەتی سوود لە وەسف ببینێت وەک دەڵێت: (حاجی) بەپەلە هێمای سەرکەوتنی بە پەنجەکانی پیشاندام و لە چاو ونبوو.

تەلبەندەکانم بەرزکردەوە، لە ڕاستیدا چاوەڕێی ئەوە بووم کە فیشەکێک لە پشتەوە لەناکاودا، تەپڵی سەرم هەڵگرێ، زۆرم دەربارەی کوشتاری ئەم سنوورە بیستبوو، خۆم بە ئەسپایی خستە ژێر تەلبەندەکەوە و چوومە ئەودیو.

(قامیشلی) لە دوورەوە دیار بوو، چەند هەنگاوێک لە تەلبەندەکان دوورکەوتمەوە و بۆ دوایین جار ئاوڕم لە تورکیا دایەوە.

پاسەوانی نێو قوللەکان وەک داڵی مەرگهێنەر هەڵنیشتبوون، لووتکەی نووکی تەلە دڕکاوییەکان لەبەر تیشکی خۆر دەبریسکانەوە.

بەتەنیا، قاچاغ، هەڵاتوو، بێ پارە بێ پاسەپۆرت و نەشارەزا بەرەو پارچەیەکی تری کوردستان ملم نا... لە کۆتا دێڕەکانی بووژانەوەی ژیلەمۆ) چونکە لە دەستپێکی ڕۆمانەکە نووسەر هەرچەندە بە ڕووداو دەستپێدەکات، ڕووداویش بزوێنەری ڕۆمانە، بەڵام دەکرا بەشێوەیەکی دیکەیش دەست پێ بکات تێیدا تەکنیکی تازە بەکاربێنێت، بۆ نموونە: دەکرا لە کۆتاییەکەی دەست پێ بکات، چۆن؟ دەکرا ئەوکاتەی دەگاتە "قامیشلۆ " هەرچەندە کۆمەڵێک موعاناتی دیکە سەرهەڵدەدات، چونکە وەک دەڵێت: (بە تەنیا، قاچاغ، هەڵاتوو، بێ پارە و بێ پاسەپۆرت و نەشارەزا بەرەو پارچەیەکی تری کوردستان ملم نا) لەوێ کە ڕزگار دەبێت، لەو کاتەی دەکەوێتە شوێنێکی پارێزراو، سەرەتا بەشێوەی خۆدواندن "مونولۆگ" پرسیار بکات ئاخۆ دەبێت ئێستا هەواڵی دایکم و سلێمانی چی بێت؟! ئەی هاوبەندییەکانمان دوای ڕاکردنی ئێمە لە زیندان دەبێت چییان بەسەرهاتبێت؟! ئەی هاوڕێ پێشمەرگەکانی شاخ! ئیدی قەڵەم و دەفتەری هێنابا و بە شێوەی "فلاش باک" گەڕابایەوە سەرەتای بیرەوەری و ڕووداو و ڕۆمانەکە.

**ڕەهەندی دانان و بڵاوکردنەوەی وێنەی بەشێک لە کارەکتەرەکان:**

نیشاندان و خستنەڕووی ئەو دەقە کۆنکرێتییانەی تژیین لە جەربەزەیی و ڕووبەڕووبوونەوەی ئیرادەی مرۆڤ بەرانبەر ئەو نەسەق و خۆسەپێن و کۆلۆنیالیزمانەی ڕەگیان بەدرێژایی بووندا شۆڕبۆتەوە لە قۆرخکردنی "ئازادی" و بە کۆیلەکردنی ئەوانی دی، بێ گومان ئاسان نییە، لەگەڵ ئەوەیش هەمیشە ئیرادەی ویستی ئازادی سەردەکەوێت، ئەم سەرکەوتنەش لە بازوو و بیری چەندین پاڵەوان بەرجەستە دەبێت، بۆ

دواتریش ئەم پاڵەوانانە دەبن بە فیگەری نێو تابلۆی بەرزی مانەوە و نەمریی، بەشێوەیەک سەرکەوتنیان هەمیشە سکەیج و هێڵکاری بێت لە خەیاڵدانی نیگارکێش،

پێکەوە گرێدان و جارێکی تر کۆکردنەوەی وێنەی کارەکتەرەکانی نێو (کۆ ڕۆمانی بووژانەوەی ژیلەمۆ)ی ڕۆماننووس "سەلام عەبدوڵلا"، بەو هۆیەی خۆی کارەکتەری سەرەکی ڕووداوەکەیە لە بەرگی (سۆران) هەوڵیداوە لە یادەوەری خۆی بیپارێزێت و وەک ئەزموونێکی جوانی بوونناسی بیهێڵێتەوە، دواتر پێشکەش بە خوێندەوارانی دنیای بکات، پێمان بڵێت بیرەوەرییەکان هەرچی بن بەشێکن لە بوون و نەمریی خاوەنەکەی، بۆیەشە بزربوون و نەمانی بیرەوەرییەکان دەبنە مردنی "مەجازی"بوونی تاک بەر لە مردنی "حەقیقی"؛ بۆیە بە دانانی بەشێک لە وێنەی ڕاستەقینەی کارەکتەرەکانی ناو ڕۆمانەکە دڵنیام خوێنەری جدیی تامەزرۆی بینینی ڕوخساریان دەبێت، ویستم دیوی واقیعێتی ڕۆمانەکە زیاتر بخەمە ڕوو، ئەگەرچی بەشی زۆریی کارەکتەرەکان شەهیدبوونە، بەڵام بۆ هەتا هەتایە لە زاکیرەی خوێنەر و دڵی نەتەوەکەیان زیندوو دەمێنن، بۆیە بە پێویستمان زانی وێنەکانییان دابنێین .

### لەبارەی ڕێنووس و پێداچوونەوەی دەقی ڕۆمانەکەوە:

هەروەک ڕەخنەگری کورد (گۆران سەباح) دەڵێت: ( تۆنی نووسین وەک تۆنی قسەکردنە...)ل ٢٤ چۆن رەخنە لە ڕۆمان بگرین، ئەوا بەشێوەی گشتی زمانی نووسینەکە دوورە لە گرێ و ئاڵۆزی، تۆنەکەی جۆرێکە هەموو خوێنەرێک بە ئاسانی لێی تێدەگات، بەڵام هەندێک هەڵەی ڕێزمانی تێدا بەدی دەکرێت، کە تا دووبارە و سێبارە نەبووەوە نەمدەویست بیکەمە سەرنجێکی وا، بۆنموونە لە سەرەتای ڕۆمانەکە و زیندانی هەیئە، وشەی (بەند) یان (بەندەکان) لەشوێن وشەی (بەندی) و

(بەندییەکان) بەکارهێنراوە، هەروەها لە بابەتی گواستنەوەی چەکیش وشەی (سمیرنۆڤ) کە جۆری چەکەکەیە دووجار بەهەڵە نووسراوە کە مەبەست لێی چەکی (سیمنۆڤ Simonov) ـە.

# ئەنجام

* خوێندنەوەی ئەم ڕۆمانە گرنگی خۆی هەیە تێیدا خوێنەر بەر خۆشەویستی خاک و ئازادی و سەرهەڵدانی بیریی ناسیۆنالیزمی دەکەوێت، دوور لە هەرچی ڕەگەزپەرستی و پاراگماتیزمی هەیە، بەڵکو ئیرادەی سۆران لە پرۆتۆکۆڵەکەی لەگەڵ هەوڵ و کۆڵنەدان سەردەکەوێت و ژیان لە چنگی مردن دەسێنتەوە و جارێکی دیکە لەبەرزاییەکانی نەبەردیی ئاڵای شۆڕشەکەی دەشەکێنتەوە، بەتاییەت بۆ جیلی ئێستا زۆر زەرووره پێی بزانێت کەوا شۆڕشگێڕەکانی نەتەوەکەی چۆن ئەمڕۆیان هێناوەتە کایەوە، قسەیەکی جوانی دۆستۆڤیسکی گەورە نووسەرم هاتەوە یاد کاتێک لێی دەپرسن: (بۆچوونت چی بوو کە وەختی خۆی خەریک بوو بتکوژن؟! بەڵام بڕیار هات لەسێدارەت نەدەن .

دۆستۆڤیسکی لەگەڵ دیسمبەرییەکاندا بوو، بزووتنەوەیەک بوون دژی قەیسەر، زۆر نووسەری دیکەی لەگەڵ بوون بەشی زۆریان لەناو بردن، هەندێکیشیان بۆ "سیبریا" دوورخرانەوە، لەوەڵامدا دۆستۆڤیسکی دەڵێت: مرۆڤ هەر دەمرێت، مردن ئاساییە، بەڵام ئەمن خەمی خۆمم نەبوو، خەمی سەری ئەو پاڵەوانانەی ناو رۆمانەکانم بوو کە لەمێشکمدا بوون، ئەوان هەموو لەگەڵ مندا لە سەرییان دەدرا! سەرچاوە: کتێبی مرۆڤێکی تەنیا لە بن کەوشەنی کتێبدا/ جووتیار قارەمان)، بۆیە مامۆستا سەلامیش ئەم ڕۆمانەی نەنووسیبایەوە خوێنەری جددی کورد لە زۆر هەقیقەت بێبەش دەبوو، یانیش ئەگەر نووسەر لەسێدارە بدرابا و لە ڕاکردنەکە سەرکەوتوو نەبووبا دیسان ئەو ڕۆمانە نەدەنووسرا و کارەکتەرەکانی لەگەڵ لەسێدارەدانی نووسەر لەسێدارە دەدران و

نەدەخولقانە ناو جیهانی ڕۆمانەکە، چجای هەندێک لە کارەکتەرەکان کە دووجار لەسێدارە دەدران، جارێک وەک زیندانییەکی سیاسی کە فەرمانی لەسێدارەدانیان بۆ دەرچوو بوو، جارێکیش وەک کارەکتەری ناو ڕۆمانەکە.

*هەموو ئەوانەی ئێستا لە کۆمەڵگەی هاوچەرخی جیهانیی بوونەتە ژمارە و باس دەکرێن، بەشێک وەک هێمای ئازادی، هەیانە وەک سیمبولی ئاشتی، تیاشیاندایە وەک ڕەمزی ئازایەتی، ئەوجا هەر ئەو پاڵەوانە جیهانییانە بەدەیان شێوە لەنێو گوتار و لێکۆڵینەوە و تەنانەت شیعر و پەخشانیش ناویان دەهێنین، ئەی ئەوەنییە (دڵشاد عەبدوڵڵا) "سیزیف "ی پاڵەوانی بەخۆی و "بەرد"ەکەیەوە ئاخنیوەتە شیعرەکانی و (سەرکەوت رەسوڵ)یش "سپارتاکۆز" و لەشکرەکەی، ئەو ناوانەی ئاماژەمان پێیاندا، ڕۆژێک لە ڕۆژان لە فەزای تاکەکەسی خۆیان تەنیابوونە و بەڕۆڵگێڕانی خۆیان و پێزانینی ئەوانی دیکە، توانیویانە سنووره لۆکاڵییەکان ببەزێنن و ببنە بەشێک لە کەسایەتییە جیهانییەکان، کام لەمانە دەرگای زیندانی دزێوترین دیکتاتۆرییان شکاندووە؟! کوا پەیکەری شانازی و بوێری (سەلام عەبدوڵڵا ـ سۆران ـ) بۆ لە هیچ کووچە و بان و تاریکی و ڕووناکیی، سەر شاخ و دامێن، هەوار و چۆڵیی، چوارڕییان و نزیک ترافیک نابیندرێ؟! بیرتان نەچێت (سەلام عەبدوڵڵا) چاوی هەموو شەهیدێکە، سڵاوی بەجێماوی هەموو قارەمانێکە، نەک هەنووکە دەبوو هەر دوای سەربەخۆیی هەرێم گەر لە بەردەم (هەیئەخاسە و گەڤەڕ)یش نەدەکرا لە بەردەم گۆڕەپانێک، لەپاڵ شاخێک، ڕەشماڵێک، ڕووبارێک، گوندێک ، یان سێگۆشە سنوورێک، پەیکەرێک بەقەت قامەتی بەرزی ئازادیی بۆ داندرابایە، ئەو بەهیچ کوێیەکی ئەم نیشتمانە نامۆ نییە، بەڵکو دەست لەسەر سینگ و هوتافی نەتەوەیی هەرچی هەیە لەدەردی سەری ڕۆژانی ڕەش و یادەوەریی

شایەدی نەبەردیی بۆ دەدەن، بۆیە ڕووی ڕەخنەم لە لایەنی پەیوەندیدارە و ناکرێت قارەمانێک و پۆلێک هاوڕێی کە (١٢) کەس بوونە لەبەردەم ئەشکەنجەی سادییەت و توتالیزمی ئێراقی زیندان دەشکێنن و ڕادەکەن فەرامۆش بکرێن، بەڵکو قابیلی ئەوەن ناویان لە دیواربەندێک بنەخشێنرێت و پەیکەریش بۆ ڕابەری ڕاکردنەکە درووست بکرێت.

*ئەوەی جێی دڵخۆشییە ئەم کۆڕۆمانە لەلایەن نووسەر و رەخنەگری کورد (د.گۆران سەباح) وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی ئینگلیزی، هەروەها لەلایەن نووسەرانی دیکەیشەوە بەشی زۆریی بۆ زمانی (عەرەبی و فارسی) وەرگێڕدراوە، بێگومان ئەمەش خزمەت بە پرۆسەی بەجیهانیبوونی ڕۆمانەکە دەکات و دەنگ و پەیامی ئەدەبی کوردیش دەگەیەنێتە دەرەوە.

# بەشی سێیەم

## ڕووی مەیدانیی لیکۆڵینەوە و وەرگرتنی وەڵامی پرسیارەکانی خوێنەر

**(دەستخستنی وەرام بۆ ئەو پرسیارانەی لەنێو کۆڕۆمانی بووژانەوەی ژیلەمۆ بە داماوی ماونەتەوە و خوێنەر وەک کەلێنێکی موحتاج بە پڕکردنەوە دەیانبینێت، یاخود دەکرێت ناوی بنێین چیڕۆکی پڕکردنەوەی ئەو درزانەی لە ڕۆمانی بووژانەوەی ژیلەمۆ بەجێماون)**

من ڕێبواری نێو کۆڵانە بەپێچەکانی کتێبم، دەڕۆم و دەگەڕێم، بە هەورازە ڕکەکانیدا هەڵدەگەڕێم، لە لێژاییەکانیاندا بە نەرمەغار دادەگەڕێم و پێدەشت و بیابانەکانیان بە پشوودرێژی دەبڕم، لە نسێی دامێن ئاواییەکانیاندا پشوو دەدەم و لە کانیلەی هەست و سۆزیان دەخۆمەوە و تینوویێتیم دەشکێنم، من ڕێبواری کتێبم و کتێب جیهانی منە. لە گەشتی ئەو کەڕەتەمدا لە کۆڵانە پڕپێچ و بەڕاکە ڕاکەکانی (بووژانەوەی ژیلەمۆی) سەلام عەبدوڵڵا ساردی و گەرمی زۆرم بینی، سوچاوسوچ ڕامام و وردبوومەوە کە لە تخووبی کۆتایی کتێبەکە هاتمە دەرێ و لێی بوومەوە هەندێ پرسیاری جیا لە گرێی هونەری نووسین بەگرێ مانەوە و لەنێو ئاوەزمدا داوای وەڵامیان کرد، هۆپێکم لەخۆم کرد و گوتم: باشە خۆ ئەو ڕۆمانە دیکۆمێنتارییە و سۆرانی ناو ڕووداوەکان خودی نووسەر خۆیەتی، بۆ نەچم وەرامی ئەو پرسیارانەی لێ وەرگرم و بیخەمەوە نێو درزی بەجێماوی بالاخانەی ڕۆمانەکە! .. چووم .. لەدەرگام دا و فەرمووی

لێم کرد، دوای سڵاو و هەواڵپرسین پرسیارە هەراسانەکانی نێو ئاوەزم چەپک کردن و خستمنە بەر دەمی.

ئاوڕێکی لە پەنجەرەکە دایەوە و کەمێک تەماشای ڕووناکی کرد وەک ئەوەی تازە زیندانێکی شکاندبێ و بیەوێت چێژ لە ڕووناکی وەربگرێ، دوایی ڕووی وەرچەرخاند و قومێکی لە قاوەکەی بەردەمی دا و بۆ هەستی پڕسوێی دایکی دوای ئازاد بوونی گوتی: ئەوکاتەی من گیرام لە دایکم دابڕام و هیچ هەواڵێکیم نەدەزانی، تا ئەو ڕۆژەی ڕامکرد و گەڕامەوە سلێمانی، دوای ئەوەش بەڕاستی من ویستوومە ئەوەی بەسەرم هاتووە بینووسمەوە، ئەگەرنا دوای ئەوەی ڕامکرد و گەیشتمەوە سلێمانی دوای چوار ڕۆژ مانەوەم لە ماڵی دۆستێکی خۆم کە ئەمیش زیندانی بوو بەناوی (عومەری سەید عەلی) مامەوە و جێگەیان بۆ کردمەوە، هەرگیز بیرم ناچێت. چونکە ماڵی کاک عومەر چوارەم ماڵ بوو بۆی چووبێتم و قبووڵیانکردبم، ئەوانەی دیکە بە بیانووی جیاواز کە ناهەقیش نەبوون نەیانوێرا جێگە بۆ کەسێک بکەنەوە لە زیندان ڕایکردبێت، چونکە زەبر و زەنگی بەعس وابوو خەڵک نەیەوێرا جووڵە بکات، ئەمەش شتێکی ئاسان نەبوو تۆ ڕاکردوویێک لە ماڵەکەت بشاریتەوە، لە کاتێکا لە هەموو کۆڵانێک ماڵە بەعسییەک یان جاشێک هەبوو، ئێ بەعسیش نەک هەرماڵێک بەڵکو ڕێگرییان نەبوو گەڕەکەکەش بڕوخێنن بەهۆی داڵدەدانی ڕاکردوویێک کە فەرمانی لەسێدارەدانی هەبێت .. ئیدی لە ماڵی کاک عومەر لە گەڕەکی (شێخان)ی سەرووی مزگەوتی گەورە بۆ ماوەی چوار شەو مامەوە، ئەوان بەهۆی ئەوەی کوڕەکەیان سێ چوار ساڵ بوو زیندانی بوو سۆزیان بۆ من زیاتر بوو، بۆیە هەموو هەوڵێکیان دا بۆ شاردنەوەم، هەر لەو کاتەش بوو ئێوارەیەک دەوروبەری کاتژمێر هەشتی شەو بوو، من بەتەنیا لە ژوورێک بووم بە ئەوانیشم گوتبوو نامەوێت کەس ببینم، کەچی کاتێکم زانی دەرگای ژوورەکە کرایەوە، ژنێک هاتە ژوورەوە ئاوا سەیری

کردم و یەکسەر ڕایکردە لام و خۆی خست بەسەر پێیەکانمدا دەستەکانی دەگرتم، منیش بە شێواوییەوە: هەڵسە دایە گیان منم منم سۆران، ئیدی وەک شتێکی باوەڕ پێنەکراو دەیگوت ئەمە خۆیەتی خوایە چۆن لەم زیندانە نەفرەتییەی ڕژێم دەربازی بووە، ئایا ئەمە چۆلەکەکەیە کە من دەمگوت! دایکم باسی کرد: ئەو کاتەی تۆ لە زیندان بووی (نەزرم) کرد بوو.

گوتم: دایە گیان نەزر چییە؟!

گوتی: چەند ڕۆژێک نان ناخۆیت و دەچیتە سەرگۆڕی چەند پیاوچاک و پیرۆزێک، ئیدی دایکم چوو بووە سەرگۆڕی (پیر مەنسووڕ) لە سلێمانی و هەروەها چەند گۆڕ و مەزاری دیکەیش تا ئاخیری شەوێکیان دەچێتە پیرەمەگروون و دەمێنێتەوە لە مەرقەدی پیریی (شەوکێڵ) زۆر پاڕاوەتەوە و دوعای کردووە کە خودا سەلام - سۆران-ی کوڕی لە زیندانی بەعس ڕزگار بکات، وەک چۆلەکەیەک باڵبگرێت و بگەڕێتەوە لای! ئیدی خەون دەبینێت و پێی دەڵێن بچێتەوە ماڵ و کوڕەکەی ئازاد دەبێت و دەگەڕێتەوە لای.

بەڵام ئەوەی سەیرە و جێی سەرنجە .. دوو ڕۆژ بەر لە ڕاکردنەکەم کە کۆتایی مانگی ڕەمەزان بوو ئیدی دواتر دەبووە جەژن، زۆر بەڕاشکاوی بەو هاوڕێیانەی ناو زیندانم  گوتبوو پێش جەژن من لە سلێمانیم، بەهۆی ئەوەی فەرمانی سێدارەم هەبوو هەموو شتێکم بە ڕاشکاوی دەگوت، ئیدی ئەمە ناو دەنێن چی کاتێک دایکێک ئاوا بۆ رۆڵەکەی بکات، رۆڵەکەشی لەزیندان ئاوا جەربەزە و متمانە بەخۆی بێت، ئەم چەند متمانەی هەبوو ڕزگار دەبم، منیش ئەوەندە متمانەم بەخۆم هەبوو ڕزگار دەبم.

بۆیە گوتم: دایەگیان ئەمە زۆر خراپە هاتووی بۆ ئێرە، ئیدی دوای خواحافیزی هەرکە ڕۆشتە دەرەوە منیش دوای ١٠ خولەک یەکسەر

ڕۆیشتم و ماڵەکەم گۆڕی، ئەو کاتە تەلەفونی (نورماڵ) هەبوو، هەوڵمدا پەیوەندی بکەم، چوومە ماڵی (کاک موژدەی موهەندیس)ی هاوڕێم که خەڵکی سلێمانییە، چەند شەوێک لەوێ مامەوە، دواتر ڕۆیشتمە ماڵی ناهیدەخانی دایکی دکتۆر رۆژ نوری شاوەیس، لەوێش دوو رۆژ مامەوە، ئیدی بەم پێیە من نۆ ڕۆژ لە سلێمانی مامەوە تا دەربازبووم بۆ شاخ.

– ئەدی دوای پشوودانتان لەگەڵ عومەر لە کوخێکی ئاقاری چەمچەماڵ و جێهێشتنی هاوڕێکەت چۆن دەبێ تۆ .. سۆرانی بەندیخانەشکێن لە هاوڕێکەت نەپێچیتەوە و خوێنەر لەنێو گومان پێبردنی خراپدا بەجێبێڵی؟

* مەسەلەی عومەر کە لەگەڵم دابوو تا چەمچەماڵ، ئەوکاتەی من لەماڵی موژدەی موهەندیس بووم، هەواڵم بۆ هات، یەکێک لەو ڕاکردووانەی زیندان لەناو شاری سلێمانی گیراوەتەوە زانیم ئەوە عومەر بووە، ئینجا من لە دوای ڕاپەرین کاتێک عومەرم دووبارە بینییەوە، پێمگوت: باشە ئەی قەرار نەبوو تۆ چاوەڕێ بیت؟ تامن یارمەتیت بۆ دەنێرم؟ ئاخر ئێمە ئاوا ڕێککەوتبووین، چونکە چەکەکەشم لای ئەو جێهێشتبوو، بەڵام دیارە ئەو سەیری کردبوو من چۆن بەو ئاسانییە چوومە خوارەوە و خۆم تێکەڵی کاروانی وڵاخ و بار و خەڵکی گوندەکان کرد، دیارە ئەمیش هەر وایکردبوو، چاوەڕێی نەکردبووم، هەر دوای من هاتبووە خوار بێ ئەوەی نزیکی من بکەوێتەوە، هەر وەکوو چۆن لە زیندانیش بە دوای مندا هاتبوو، ئیدی هەروەک عومەر خۆی بۆی باسکردم گوتی: هەر تۆ ڕۆیشتی هێندەی نەبرد منیش هاتم، سەرکەوتمە تەکسییێک، تەکسییەکەش خزم دەرچوو و پرسیاری کرد عومەر ئەوە تۆ لەکوێی دەمێکە دیار نیت؟! منیش منداڵانە گوتم وەڵڵا لە زیندان هەڵاتووم، ئیدی ئەویش نامەردانە منی بردە بەردەم دایەرەی ئەمن یەک ئستۆپی گرت!.. بەس ئاقڵێتییەکەی عومەر لێرەدا ئەوە بووە بەر لەوەی ئەم ڕاکاتە

بەڕێوەبەرایەتییەکە، خۆی بەلادا دەسوڕێتەوە و ڕادەکاتە دایەرەکە، خۆی تەسلیمی ئەمن دەکات و دەڵێت: بەزۆر منیان هێناوە و ئەسیریان کردووم، بەزەبری چەک، گەرنا من هی ڕاکردن نییم و ئاوا، ئیدی بۆیە ئەمانیش لە سێدارەیان نەدابوو، خستبوویانەوە زیندان، تا لێبووردنە گشتییەکەی سەدام ١٩٧٩، واتە دوو ساڵی دیکەیش زیندانی کرابوو.

ـ باشە شتێکی دی .. ئەو محەمەد تەهایەی ڕۆڵێکی سەرەکی هەبوو لە جێبەجێکردنی پلانی هەڵاتنتان لە زیندان، چی بەسەر هات، بۆ لەسەرەتای ڕۆمانەکە کارەکتەرێکی بوێر بەو ناوە دەرکەوت، کەچی هەر ئەو دیمەنەیە و کۆتایی پێدێت، پێم باشە شتێک لەبارەیەوە بە خوێنەرانی بووژانەوەی ژیلەمۆ بڵێیت؟

ئەو کاتەی من لەو ماڵە بووم کە لەسەر سنووری تورکیا و سوریا بوو، نامەیەکم نووسی بۆ کاک (غازی زێباری)م نارد وا دیارە نامەکە نەگەیشتبووە دەست کاک غازی بەهۆی ئەوەی لەوکات لەوێ نابێت، دەیدەن بە ڕەحمەتی کاک (جەوهەر نامیق سالم) ئەویش دەیخوێنێتەوە و ناوی (سەلام عەبدوڵلا) دەبینێت، یەکسەر بیریدەکەوێتەوە کەسێکیان لایە ماوەی چەند مانگێکە دەستگیرییان کردووە و ئازاریشیان داوە ناوی (حەمە تەها)یە، چونکە ئەوکاتەی ئێمە زیندانی هەیئەمان شکاند و هەڵاتین .. من و عومەر بەرەو سلێمانی ڕۆیشتین، ئەم (حەمە تەها)یەش بەڕێگای هەولێر و شەقڵاوە بەرەو بادینان دەڕواتەوە، کەسێک بێ پارە و نفوس .. چەکێکیشی لایە، چۆن خۆی ڕزگار کردووە و دەربازبووە لەم ڕێیە؟ مەگەر هەر خوا بیزانێت، بەڵام هەرخۆی کوڕێکی چاونەترس و قارەمان بوو، خۆ ئەو شەوەی ئێمە پلانی هەڵاتن لە زیندانمان هەبوو، نۆرەی ئەو بوو نەخەوێت و پاسەوان بێت، وەختێک بانگی کردم گوتی: هەڵسە ئەم پاسەوانەی بەردەگا چارەگێک دەبێت خەوتووە، ئێ خۆ ئەگەر ئەو خەبەری نەکردمایەوە کارەکە نەدەکرا و نەماندەتوانی ڕزگارمان ببێت.

ئیدی که ئەم دەگاتە لای پێشمەرگەکان لە سنووری (کۆماتە) لەلایەن کەسێک کە(جاش) بووە، بەداخەوە کە هەر ئەمیش بوو پێشتر ببووە هۆی دەستگیرکردنی (حەمە تەها)، لەوکاتە هەواڵ دەداتە پێشمەرگە کەوا حزبی بەعس حەمە تەها و چەند زیندانی دیکەی ئازاد کردووە تاوەکو بگەڕێنەوە ناو پێشمەرگە و کاری سیخوڕییان بۆ بکەن، بۆیە جەماعەت هەرکە حەمە تەها دەگاتە لایان دەستگیری دەکەن و ئەشکەنجەی دەدەن بۆ ئەوەی دان بەم کارە دابنێت کەوا ئەم سیخووڕی ڕژێمە، ئەویش لە یەکەمەوە تا کۆتایی هەر گوتبووی ئێمە سیخووڕ نین بەڵکو دەرگای زیندانمان شکاندووە و هەڵاتووین، پێشمەرگەیەکی سلێمانی بەناوی (سەلام عەبدوڵڵا) ڕێبەرێتی کارەکەی کردووە، بەڵام جەماعەتی کاک جەوهەر باوەڕیان پێی نەکردبوو، بۆیە کاتێک کاک جەوهەر نامەکەی من دەبینێت و لێی نووسراوە سەلام عەبدوڵڵا، ئێ دوای هەڵاتنم لە زیندانی (گەڤەر) ئەوان یارمەتی منیان دابوو، هەر خێرا نامەیەکی بۆ من ناردبووەوە، نووسیبووی ئەم (حەمە تەهایە) کێیە؟ ئیدی منیش پێمڕاگەیاند کە ئەسڵی بابەتەکە چییە، ئەمە بوو بەخێر و لەوێوە حەمە تەها ڕزگار دەکەن، بەڵام سەد مخابن ساڵی دواتر لە یەکێک لە ڕووبەڕووبوونەوەکانی ڕژێم شەهید دەبێت، ئەم بابەتەش کوڕەکەی خۆی بۆی گێڕامەوە.

هەموو ئەو قسانەی مامۆستا سەلام عەبدوڵڵا کردنی تەریبن لەگەڵ ئەو زانیارییانەی کاک (ڕزگار کێستەیی) پێیڕاگەیاندم کە جەنابییان ئێستا سەرۆکی سەنتەری (کۆماتە)یە و کار دەکات بۆ بەدیکیۆمێنتکردنی دیرۆکی شۆڕش و لە کتێبی بیرەوەرییەکانیشی زۆر شتی ناوازەی باسکردووە.

– لەبارەی بابەتێکی تر کە خوێنەر عەوداڵی زانینی دەبێت و (بووژانەوەی ژیلەمۆ) نەپڕژاوەتە سەری، بارودۆخی زیندانە دوای هەڵاتنی سۆران و هاوڕێکانی، سۆرانی نێو ڕۆمان و سەلامی نووسەری ڕۆمانەکە

و دانیشتووی ئێستای پشت مێزێک، بە بزەیەکی تەماوییەوە وەکە ئەوەی بەدیار دیمەنی ڕووداوەکانی ئەوساوە دانیشتبێ، گوتی: هاوڕێیەکمان بە ناوی (کاک قاسم) کە لە ژوورێکی دیکەی زیندانەکە بوو، ئێستایش شوکر لە ژیان ماوە، ئەو ڕۆژە هات بۆ لام و یەکترمان بینییەوە، گوتی: لەکاتی بەرەبەیاندا وەختێک زانیمان لەنێو زیندان پشێوی و جموجۆڵێک پەیدابوو، قەرەباڵغی دروست ببوو، دەرگاکانیان زیاتر دادەخست و باشتر قوفڵیان دەدا، هەتا شەو و ڕۆژێک نەیانهێشت بچین بۆ (توالێتیش) زۆریان لێداین، هەرچەند ئەم کاک قاسمە لە بەشی ئێمەش نەبوو، بەڵام دیارە بە گشتی ئازاریان دابوون.

ـ ئەدی سۆران کە دەگاتە قامشلی بەو زیڤاری و بێکەسی و ناشارەزاییە چی بەسەردێت؟

سۆران بەرلەوەی (نەسیبین) کۆتا خاڵی تورکیا جێبێڵێت، دوو لەو کوردە دڵسۆزانەی پێشتر لە (جەزیرێ) فریای کەوتبوون و سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستان بوون، چەکداری (جەوهەر نامیق سالم ١٩٤٦_٢٠١١) بوون کە (مەحمود گەڕگەڕیی و سەلاح جەزیری) بوون، هەروەها ئەوەی سەیارەکەشی دەهاژووشت (سەربەست زاخۆیی) بوو تەسلیمی چەند کەسێکی دیکەیان کردبوو کە هەر سەر بە پارتی بوون، یەکێکیان ناوی حاجی بوو هەر زۆر ببووە برادەری سۆران، ئیدی سۆران ڕۆییشتە قامیشلی و چووە ئەو ناونیشانەی پێیان دابوو .. ماڵی کرێکارێکی هەژار بوو هەر خۆی و ژنەکەی بوون، زوو پێیگوتن من دەمەوێت بچمە دیمەشق، چونکە دوو نامەی مام جەلالی لابوو یەکیان بۆ وەزیر (عەبدوڵڵا ئەلئەحمر) بوو ئەوەی دیکەیش بۆ (هێرۆ خان)ی خێزانی بوو، سۆران هەستی بەرپرسیارێتی و ئەرکی شۆڕشگێڕی زۆر لا پیرۆز بوو بۆیە لەنێو ئەو هەموو بەسەرهات و تەنگییانەدا نامەکانی فڕێ نەدا بوو، لەپێناو پاراستنیان لە نێو نیفۆی ڕانکەکەی شاردبوویەوە، بە گەڕان و

کۆششی زۆر مەقەری یەکێتییەکانی دۆزیبووەوە، ئەوانیش یەکسەر بردبوویان بۆ دەزگای موخابەراتی سووری؛ چونکە ئاگاداركرابوونەوە لە گیرانی کەسێک بە ناوی سۆران، ئەوانیش لاری نەبوونییان بۆ کرد و هاوکارییان کرد، بە تەیارە گەیاندیانە دیمەشق، لێرەوە سۆران دەبووژاێتەوە، دواتریش دەیبەنە ماڵی هێرۆخان، هێرۆ خانیش زۆر دڵخۆش دەبێت کە دەبینێت سۆران بەم هەموو تەنگژەیەدا ڕەتبووە و سەلامەت لێی دەرچووە، بە سۆران دەڵێت بڕیارم دابوو بچم بۆ (لیبیا) تاوەکوو لای (قەزافی) واستە بۆ ئازادبوونت بکەم .. سۆران ئەم ماوەیە لەوێ لە خانووی سەرکردەیەکی یەکێتی بەناوی (عومەر دەبابە) مابووەوە، بەڵام خانوو چ خانوو وەک باسی دەکرد: ڤێلایەکی جوان و ناوازە ئەو ماوەیە وەک مەلیک تێیدا ژیام تا پاسەپۆرت و کارەکانی سەفەریان بۆ ڕێکخستم، ئەوەبوو پاسپۆرتێکی ئەسڵی ئەردەنییان بۆ دەرکردم بەناوی (عادل شەریف تاجر)، موخابەراتی سووریش ڤیزەیان بۆ کردم، بەڕێزەوە بە سەیارەی خۆیان گەیاندیانمە فرۆکەخانە و بۆ سوید بەڕێیان کردم.

ـ ئەی بەو ناشارەزاییە لە سوید چیت بەسەرهات؟

** ئەوجا لە سوید تووشی کێشە هاتم، چونکە هەرکە خۆم تەسلیم کرد یەکسەر گوتم: من پەنابەری کوردم، ئەمانیش ڕەتیان دەکردەوە، دەیانگوت: نەخێر تۆ عەرەبیت و فەلەستینیت،

منیش هەر دەمگوت: ئەم پاسپۆرتە قاچاغە، ئەوەتا پاسپۆرت و بەڵگەی فەرمی، ئیدی بردمیانە زیندانێکی تاکەکەسی لە فڕۆکەخانەکە، شەوەکەی لەوێ مامەوە، بۆ بەیانییەکەی کابراییێکیان هێنایە لام بە سویدی قسەی لەگەڵ کردم، منیش بە ژیانم زمانی سویدیم هەر نەبیستبوو، ئەویش نیو کاتژمێر هەر قسەی کرد بێ ئەوەی بزانم هەرباسی چی دەکا، بەڵام من

هەوڵم دەدا بە ئینگلیزی پێی بڵێم: من کوردم و ئەم پاسپۆرتە تەزویرە بەڵام سوودی نەبوو، ئیدی هەڵساو ڕۆیشت.

بەڵام ئەوەی باش بوو لەبەرئەوە دەوڵەتێکی پێشکەوتوو بوو، ئازاردان و لێدان و شت نەبوو، بۆ شەوەکەی هاتن قۆڵبەستیان کردم و خستمیانە دواوەی ئوتومبێلێکی زۆر پێشکەوتوو، هەمووی بە ئوتوماتیک دەکرایەوە، فرۆکەخانەی سوید ٥٠ کم لە ستۆکهۆڵمەوە دوورە، هێندەی نەبرد گەیشتین و یەکسەر تەسلیمی زیندانێکی شارەکەیان کردم.

سۆرانی زەمەنی ئەمڕۆی پشت مێزەکە و بەردەم پرسیارەکانی من؟ دەستێکی بۆ فنجانە قاوەکە برد قومێکی لێدا، لە جوولەی دەموچاوی هەستت بەوە دەکرد بەهۆی ساردبوونەوەی قاوەکە تامێکی ناخۆشی چاوەڕوان نەکراوی چەشتووە .. کەچی بە مرچەیەک تامی دەمی لە گێڕانەوەکە خۆشکرد: دوای ئەوە دەستم بە مانگرتن کرد، ئەوانیش کەوتنە کۆکردنەوەی زانیاری، وێنەی منیان دەگرت بەڵام وێنە ها .. ڕەنگە سەدان وێنەیان گرتبێت، دەمێک بەلای ڕاستدا دەمێک بەلای چەپدا، هەتا وێنەی پاژنە پێیان دەگرتم! ئیدی ئەم بەزمەشیان تەواوکرد، دوایی کابراییێکی یۆنانییان هێنا عەرەبی دەزانی، ئیدی کە باسی زیندان و هەڵاتن و ئەم شتانەم بۆی کرد زۆر کاریگەر بوو، هەر دەیگوت: زۆر سەیرە ئەمە چۆن .. یانی تۆ کوردی؟

منیش گوتم: بەڵێ بەڵێ من کوردم و تەواو، دوای سێ ڕۆژ مانگرتن ئیدی هەمان ئوتومبێل هات و سەریانخستم.

سۆران لە ناخی خۆیدا دەیگوت: بەخوا ڕەنگە تەسلیمی ئێراقم بکەنەوە، زیاتری ترسەکەیشی لەبەر ئەوە بوو ئۆتۆمبێلەکە بە ئاراستەی فڕۆکەخانە دەیهاژووشت، ئەو چەند ڕۆژەیش کە بێ هەواڵ بوو جەماعەتی یەکێتی هەواڵیان پرسی بوو، بەڵام پێیانگوتبوون بۆ تەحقیق بردوومانە، کاتێک بابەتەکە دەبێتە کاری دەزگای موخابەرات ئیدی کەس نزیکی ناکەوێت

دەبێتە شئونی ئەمنی، بۆیە سۆران لە فڕۆکەخانە زۆر بێ هێز و نیگەران دەبێت، بەڵام پۆلیسەکە بە ڕووخۆشییەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکات ئەگەرچی کەلەبچەکەی بۆ نەکردبووەوە چونکە ئەوان زۆر پابەندی یاسان، سۆران دڵی بۆ ڕاکردن لێیدەدا بەڵام نەیدەزانی بۆ کوێ ڕاکات! هاوکات هەر چواردەوریشی پۆلیس بوو، ئیدی لەگەڵ پۆلیسەکە بەیەکەوە ڕۆییشتن و بردییانەوە ژوورەکەی خۆی، لە ژوورەوە دوو پیاو دانیشتبوون بە کوردی گوتیان: ئای ئای مامۆستا گیان .. ئەوان نوێنەری یەکێتی بوون، یەکێکیان هاوەڵزاواکەی مام جەلال بوو (حەمە سابیر)، پۆلیسەکە هەر خێرا ڕووی تێکردن بە خۆشییەوە پێی گوتن: ئا بەم برادەرە کەللە ڕەقەتان بڵێن با شتێک بخوات، سێ ڕۆژە نانی نەخواردووە،

ئەوانیش گوتیان: بۆ نانت نەخواردووە؟

سۆران: مانم گرتووە،

گوتیان: کاکە ئێمە لێرەوە هەر لەسەر هێڵ بووین.

ئیتر چایان هێنا و پۆلیسەکە تەوقە لەگەڵ سۆران دەکات و دەڵێ: ئەوەش قارەمانەکەتان، سۆران لەم چەند ڕۆژەی لەوێ بوو بەهیچ شێوەیەک ئازارییان نەدابوو، بەڵام زۆر تەحقیقیان لەگەڵ کردبوو، تەحقیقیش لەپێناو گەییشتنە بە بنچینەی ڕاستییەکان، لەوێ ژوورەکان یەک نەفەریین، دەرگاکانیان دەسکی نییە، بە مایکرۆفۆن قسە لەگەڵ دەرەوە دەکەی، لە کونێکەوە خواردنت دەدەنێ، ئیدی هەمووی شوێنی نهێنییە و هەواڵگریی وایە.

## سەرچاوەکان

### سەرچاوە بەزمانی کوردی:


- ڕۆمانی بووژانەوەی ژیلەمۆ / سەلام عەبدوڵڵا
- ڕۆمانی ئەو هەورە کپە، ژیاننامەیەکی کۆچ / بەیان سەلمان
- ڕۆمانی ساڵێک لە دۆزەخ / مەهاباد قەرەداغی
- هونەری چیرۆک نووسین / حەمەسەعید حەسەن
- ئەدەب و ئازادی / وتار / حەمەسەعید حەسەن / ڕووداو نێت ١٨-٠١-٢٠١٦
- هونەری ژیاننامە / سەنگەر زراری
- چۆن ڕەخنە لە ڕۆمان بگرین / گۆران سەباح
- میتۆدەکانی ڕەخنەی ئەدەبی – ڕەخنەی ئەدەبی لە ڕووی تیۆرییەوە / حەمە مەنتک
- ڕۆمانی بەندەر فەیلی/ بەختیار عەلی
_ دەروونناسی کۆمەڵایەتی/ دکتۆر خەلیل عەبدولڕەحمان معایتە
- دەروونناسی سیاسی تاکگەرایی و کۆمەڵگەرایی/ کوانگ ئیل یون/ وەرگێڕانی: ئاراس ئەنۆر
- ڕەشەبای ژەهر و ئەنفال/ عەبدوڵڵا کەریم مەحمود
_ بلند محەمەد، سۆتنگەهـ (ڕۆمان)، وەشانێن ئێکەتییا نقێسەرێن کورد/ دهۆک- ٢٠٠٥.
- لانی کەمی سۆزبەندی/وتار/ حەمەفەریق حەسەن .. سایتی دەنگەکان
- کتێبی (بیرەوەرییەکانم) / موسا عەنتەر / وەرگێڕانی: محەمەد عزەددین.
- ڕۆمانی زمانبڕین : فەرزین کەریم.

ـ ڕۆمانی خەمی مەستوورە  : میران ئەبرەهام
ـ ل ژێر سیبەرا چیا / ژ بیرەوەرییێن شۆڕش و بەرخوەدانێ / ڕزگار کێستەیی
ـ بنەماو میتۆدەکانی ڕەخنەی ئەدەبی / د.نەسرولڵای ئیمامی / وەرگێڕانی لە فارسییەوە/ سەنگەر نازم و هیمداد حوسێن .
ـ ڕۆمانی پێشمەرگە / د. ڕەحیمی قازی
ـ ڕۆمانی گابۆر/ سەید قادر هیدایەتی
ـ ڕێبازە ئەدەبییەکان / د. فەرهاد پیربالْ
ـ ئەدەبی بەراوردکاری / عەزیز گەردی
ـ پلۆت لە چیرۆکی کوردیدا / د. بوشڕا کەسنەزانی

**سەرچاوە بەزمانی عەرەبی:**

ـ وهاد الموت : قصص قصيرة جدا / كاكە مەم بوتانی /٢٠١٤
- رواية القوقعة/ مصطفى خليفة
- رواية شرق المتوسط/ عبدالرحمن منيف
ـ رواية الجدار / جان- بول شارل ايمارد سارتر
- مذكراتي في سجن النساء/ د.نوال السعداوي
- ايمن العتوم، يا صاحبي السجن (رواية)، الطبعة الثانية، ٢٠١٣.
- هادي العلوي، من تاريخ التعذيب في الإسلام، مؤسسة المدى، دمشق- ١٩٩٩.
ـ أدب السجون / شعبان يوسف
ـ النقد المنهجي عند العرب / و منهج البحث في الادب و اللغة / محمد مندور
ـ النقد الادب الحديث / الدكتور محمد غنيمي هلال

## پەری عومەر خەیلانی

- ئەزموونی زیاتر لە پانزە ساڵ لە بواری نووسین و ڕۆژنامەگەری
- هەڵگری بڕوانامەی بەکالۆریۆس لە زمان و ئەدەبی ( عەرەبی)
- خاوەنی دەیان توێژینەوەی ئەدەبی بڵاوکراوەیە لە بوارەکانی (شیعر و ڕۆمان)
- ڕۆمانێکی بڵاونەکراوە بە ناوی: لووتکە لە تەمومژدا)
- لێکۆڵینەوەیەکی بڵاونەکراوە بەناوی(سۆسیۆلۆجیای تەسەووف لە کۆمەڵگەی کوردیدا)



شەهید خالید هەولێری ئەو کارەکتەرەی دوای شکاندنی دەرگای زیندان ، بەنهێنی چووە ژووری پاسەوانەکان سێ چەکی دیکەی هێنا، دواجاریش بۆ تۆڵەکردنەوەی شەهید ئارام هاتەوە ناو سلێمانی و بەبریندارى کەوتە دەست رژێم و شەهیدکرا.



سۆران و مولازم عومەر



شەهید خەسرۆ ئەوکارەکتەرەی لەپێناو رزگاربوونی هاورێکانی خۆی کوشت و شەهید بوو.. بەداخەوە تا هەنووکە روفاتەکەی لە شاخ نەگەڕێندراوەتەوە ، بەدریژایی ساڵ سەربازی ونە ، بەهارانیش دەبێتە گوڵاڵە سوورەی کوردستان



شەهید ئارام کە لە کاروانی چەک هەواڵی شەهیدبوونی پێشمەرگەکان زیاتر یاخی دەکات



وێنەی شەهید مولازم (ئەنوەر مەجید سوڵتان ) هاوڕێی سۆرانی پاڵەوان .. کە دوای ساڵانێک لە شەهید بوونیشی سۆران بۆ هێشتنەوەی ناوی بە زیندویێتی کوڕەگەورەکەی ناو دەنێت (ئەنوەر)



وێنەی دایکە نازدار .. دایکی کارەکتەری سەرەکی سۆرانی قارەمان، لە ساڵی (١٩٨٧) کۆچی دوایی کردووە



د.چالاک (کەریم دادەمەنە) ساڵی١٩٨٥ شەهید بوو
لەکاروانی چەک باسکراوە



کاک نەبەز (خاڵە نەبەز) لە سێگۆشەی سنوور باسکراوە



کارەکتەری شێخ سدیق بەداخەوە لەژیاندا نەماوە، ئەو کارەکتەرەی خاوەنی (بارگێرەکە) بوو لەگەڵ تەقەی خۆشی پێشمەرگەکان کەوتە خوارەوە



کارەکتەری ڕۆمانەکە شەهید (سەروەر- دەروێش ) کە لەکاتی ڕاکردنەکەیان لەزیندان دەکەوێت پێی لەجێ دەچێت



یەکەم وێنەی سۆرانی پاڵەوانی سەرەکی نێو رۆمانی بوژانەوەی ژیلەمۆ، دوای ئەوەی لەزیندان رادەکات و دەچێتە چیاو دەبێتە پێشمەرگە.. وێنەکە لەلایەن وێنەگرێکی سویدی بەناوی ( ئان ئیریکسون) گیراوە



کاک موژدە لەپاڵ کارەکتەری سەرەکی رۆمانەکە (سۆران) کاک موژدە لەگەڵ ماڵەوەیان هاوکاری سۆرانییان کرد بۆ دەربازبوونی لەناو شاری سلێمانی و هەروەها دابینکردنی کەل و پەل و پێداویستییەکانی ژیانی پارتیزانی



نووسەر و کارەکتەری سەرەکی سۆران لەگەڵ عومەر و ئەبوبەکر تەرەماری، عومەر لەژیاندا ماوە و ئەو کارەکتەرەیە کە هەتا چەمچەماڵ لەگەڵ سۆران بوو



کارەکتەر شەهید خاڵە عەفان لەگەڵ کارەکتەری سەرەکی رۆمانەکە (سۆران).



پێشمەرگە لە ناوزەنگ. لەچەپەوە خۆم، هاوڕێ جەبار، زیرۆ عەبدوڵا ١٩٧٨



کارەکتەری سەرەکی رۆمانەکە لەگەڵ کۆمەڵێک کەسایەتی نێو شۆڕش:
ناوەکان لەراستەوە، مولازم عومەر، مام جەلال، د.مەحموود، سەلام عەبدوڵلا، قادر ئاغا.
دانیشتووەکان، ئیبراهیم جەلال، نەوشیروان مستەفا، عەلی مام سۆفی



کارەکتەری سەرەکی پاڵەوان سۆران لەگەڵ پۆلێک پێشمەرگە کە تێیدا
کاک عەزیزیش دیارە



دیمەنێکە لە زیندانی هەیئە ، ئەو زیندانەی سۆرانی قارەمان دەرگای شکاند و خۆی و ١٢هاوڕێی تێیدا رایانکرد